

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **جوانکاریی شیعری کلاسیکی کوردی**
- **نووسەر: د.** ئیدریس عەبدوڵڵا
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جمال رواندزی
- **بەرگ:** هێمن
- **نرخ:** ٣٠٠٠ دیناری
- **چاپی یەکەم :** ٢٠١٢
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی هێڤی (هەولێر)
- لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٩٩١) ساڵی (٢٠١١)ی پێی دراوە

**زنجیرەی کتێب (٦٤٦)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێرستی بابەتەکان

**پێشکەشە بە:**

**- ڕۆحی دایکم..**

ئەو ژنە بەڕێزەی گەورەی کردم و شتی زۆر گرنگی فێرکردم

**- ڕۆحی باوکم..**

ئەو پیاوە بەڕێزەی بە بیر و ماندووبوونی خۆی پێیگەیاندم

هەمیشە دەڵێم خودا ئێوەی پێم نەبەخشیبووایە، من قەت نەدەبوومە ئەو پیاوەی ئەمڕۆ، بۆیە سوپاسی خودای میهرەبانم دەکەم.. ئینجا سوپاسی ئێوەی ئازیزیشم دەکەم و هەمیشە لە دەفتەری بیرەوەرییەکانم وەکو دوو فریشتەی خێر و جوانی دەمێننەوە.

بچووکتان ئیدریس

شەوی جەژنی قوربانی ١٤٣١ی هیجری

١٦/١٧ی تشرینی دووەمی ٢٠١٠ی زایینی

# دەروازەیەك بۆ رەونبێژی

لە وەتەی ئادەمیزاد هەوڵی ئەوەی داوە، جۆرە گوتارێك دابێنێت، جیا بێت لە گوتەی ئاسایی سەرزاری خەڵك، بۆ ئەوەی کاریگەری زیاتر دروست بکات و گۆڕان بەرهەم بێنێت، هونەرەکانی (رەوانبێژی)ش پەیڕەوییان لێکراوە، بەڵام بێ ئەوەی داهێنەران ئەو هونەرانەیان پۆلێنکردبێ و یاساکانیان خستبێتەڕوو، بەڵام دواتر لە سەردەمی یۆنانییەکان وردە وردە ئەو هونەرانەی (رەوانبێژی) دەستنیشانکران، کە بە هۆیانەوە گوتار لە سادەیی رزگاری دەبێت و دەقی ئەدەبی لێ بەرهەم دێت.

لای یۆنانییەکان رەوانبێژی سەرەتا وەکو هونەرێك بوو، بۆ داهێنانی گوتار، دواتریش بۆ هەموو دەربڕینێکی زمانی سوودی لێوەبگیرا، تا لەوەش زیاتر وای لێهات رەوانبێژی بە هاوبەشی لەگەڵ هونەرە شیعرییەکانی تر توانی بۆ هەموو ئەدەب درێژببێتەوە، چونکە سەرەتا وەکو ئاماژەی بۆ کرا، چەند ئامۆژگارییەکی سادە بوو، بۆ پێشکەشکردنی دەربڕین، دواتر وردە وردە فراوانبوو و بووە خاوەنی ژمارەیەکی زۆری هونەری لەیەکجیا، کە هەریەکەی بنەما و یاسای تایبەتی خۆی هەبوو بۆ داهێنان، بەمەش ئیدی وای لێهات، چ سیاسی و چ شانۆنووس و چ شاعیر و وتارخوێنی ئاینیش کەم یان زۆر کەسیان نەتوانن چاویان لە هونەرەکانی رەوانبێژی بپۆشن و بەبێ ئەو هونەرانە شتێکی پڕ کاریگەری و بەهێز پێشکشەش بکەن.

دوای یۆنانییەکان لەلای عەرەب و فارس و کورد و نەتەوەکانی تریشەوە، بایەخ بە لێکۆڵینەوە رەوانبێژییەکان درا.

دوای ئەو پێشەکییە، جێی خۆیتی پێناسەی رەوانبێژی بخەینەڕوو، بزانین ئەم زاراوەیە چ واتایێك دەگەینێت؟ لە راستیدا پێناسەی لەیەکجا بۆ ئەو زاراوەیە کراوە، رەنگبێت یەك لە گرنگترین پێناسەکانی ئەوە بێت، کە بریتییە لە کورتبڕی بێ کەم و درێژبڕی بێ زیادە.

ئەم پێناسەیە فەلسەفەی هەموو داهێنانێکی زمانی دەخاتە بەر چاو، کە قەوارەکەی کورت، یان درێژیش بێت، لە هەمانکاتدا ئەوەش دەچەسپێنێت، کە کورتکردنەوەی دەق دەبێت بە رەچاوکردنی پێویستییەکان و درێژکردنەوەشی هەر بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێویستیانە بێت، کە بۆ داهێنانە ئەدەبییەکە گرنگە، بە واتایەکی تر: نابێت لە دەقی کورتدا شتانێکی گرنگ ون بووبن، کە پێویست بوون بن، بە هەمان شێوە نابێت لە دەقانی درێژیش شتانێك هەبن، زیاد بن، نەزانرێ لەبەرچی هێنراون؟

یەکەم کەس کە ئاماژەی بە هەندێ هونەری رەوانبێژی کردبێ (ئەرستۆ)یە، ئەویش لە هەردوو کتێبەکانی: (هونەری شیعر) و (هونەری دوان)، ئەرستۆ کە هات لە دەقە ئەدەبی و سیاسییەکانی سەردەمی خۆی کۆڵییەوە (شانۆنامە و خیتابە)، بۆی دەرکەوت ئەم دەقانە بەسوود وەرگرتن لە هونەرەکانی رەوانبێژی بەهێزتر و جوانتر دەبن. دوای ئەوە (هۆراس)ی رۆمانی هات، ئەویش لە (هونەری شیعر)ی خۆی جەختی لەسەر گرنگی هونەرەکانی رەوانبێژی کردەوە. پاش ئەمانە عەرەبەکانیش هەریەکە لە (فەرا) و (ئەبو عوبەیدەی کوڕی موسەنا) و (جاحز) و (سەکاکی) و (ئیبن و موعتەز)و... دەیانی دیکە گرنگییان بە رەوانبێژی داو هونەرەکانی رەوانبێژییان بەرەو فراوانتری هێنا. هەرچی لای کوردانیشە، یەکەم کەس کە لەسەر رەوانبێژی نووسیبێ (شێخ نوری شێخ صالح)ە، ئەو لە زنجیرە وتارێکی بە ناونیشانی (ئەدەبی کوردی) لە ساڵانی (١٩٢٦ـ١٩٢٧) لە رۆژنامەی (ژیان) بێ ئەوەی باسی لە وشەی رەوانبێژی کردبێ، لە ئەڵقەکانی (١٨ـ٢٥) تیشکی خستۆتە سەر هەندێ هونەری رەوانبێژی.

لە دوای ئەویش هەریەکە لە بەڕێزان (عەلائەدین سەجادی) لە ساڵی (١٩٦٨) لە کتێبی (ئەدەبی کوردی) تیشکی خستۆتە سەر هەندێ هونەری رەوانبێژی، لە پاشان مامۆستا (عەزیز گەردی) لە ساڵەکانی (١٩٧٢ و ١٩٧٥و ١٩٧٨) لە سێ بەرگدا رەوانبێژی لە ئەدەبی کوردی نووسیوەتەوە، (سەجادی)یش دیسانەوە لە ساڵی (١٩٧٨) وەکو کتێبی تایبەت بەو زانستە (خۆشخوانی) نووسیوەتەوە، هەروەها (کامڵ بەسیر) کتێبی (زانستی ئاوەڵواتا) و (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) کتێبی (بەدیع و عەروزی نامی) لە ساڵی (١٩٩١) و دیسانەوە: عەزیز گەردی کتێبێکی دیکەی مەنهەجی لەم بارەیەوە نووسیوە، بە ناونیشانی: رەوانبێژی بۆ

پۆلی دووەمی پەیمانگاکانی مەڵبەندی مامۆستایان، پۆلی پێنجەمی پەیمانگاکانی پێگەیاندنی مامۆستایان.. چاپی یەکەمی ئەم کتێبە لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە لە هەولێر، لە ساڵی ١٤٢٣هیجری، ٢٠٠٢زاینی کراوە.

(ئیدریس عەبدوڵڵا) کتێبی (جوانکاری لە ئەدەبی کوردی) لە ساڵی (٢٠٠٣) نووسیوە.

جگە لەوانەش هەندێ نامەی دکتۆرا و ماستەر و باسی دەرچوون و لێکۆڵینەوەی تایبەت بە هونەرەکانی رەوانبێژی لە گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاوکراونەتەوە، لەوانە:

١ـ عەبدولسەلام سالار عەبدولڕەحمان، هونەری رەوانبێژی لە شیعری (نالی)دا، نامەی ماستەری پێشکەشکراو بە بەشی کوردی کۆلێژی زمانی زانکۆی سلێمانی، شەوالی ١٤١٠هیجری، کانوونی دووەمی ٢٠٠٠زاینی.

٢ـ نەوزەت ئەحمەد عوسمان، وێنەی روونبێژی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بە نموونەی مەلای جزیری و نالی، نامەی ماستەری پێشکەشکراوە بە بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین، جەمادی ئاخیرەی ١٤١٢هـ، کانوونی یەکەمی ١٩٩١م.

٣ـ لایەنە رەوانبێژییەکان لە شیعری کلاسیکیدا بە نموونەی حەمدی و حاجی قادری کۆیی.. نامەی دکتۆرای خۆمە، لە رۆژی (٢٠١٠/٩/١٨) موناقەشەی کراوە، کە پێشکەشی بەشی زمانی کوردی کۆلێژی زمانی زانکۆی سەلاحەدین کراوە.

## دەروازەیەك بۆ جوانكاری

(جوانكاری) یەكێكە لە سێ بەشەكانی زانستی ڕەوانبێژی.. لە عەرەبیدا (البدیع)ی پێدەگوترێت، وشەیەكە لە ڕووی زمانییەوە بریتییە لە: (داهێنانی شت)، یان بە واتایەكی تر (البدیع) بەو شتە دەگوترێ كە : (بۆ یەكەمجار دادەهێنرێ).. لە قورئانی پیرۆزدا لەیەكێ لەو شوێنانەی باس دێتە سەر پەسنی خودای میهرەبان، (خودای گەورە) دەفەرموێت: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَاوَاتِ وَٱلأَرْضِ وَإِذَا قَضَىٰ أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾ سورەتی ﴿البقرة﴾ ئایەتی (١١٧).. واتە: خودا داهێنەری ئاسمانەكان و زەوییە، كاتێ فەرمان بە هاتنەدی شتێك بدات، دەفەرموێت: ببەو، دەبێت.. هەر لە قورئانی پیرۆزدا لە شوێنێكی تر، كاتێك (خودای گەورە) ڕووی فرمان لە پێغەمبەرەكەی دەكات (درود و سڵاوی خودای لێ بێ)، دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعاً مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾ سورەتی ﴿الأحقاف﴾ ئایەتی (٩).. واتە: بڵێ من تازانەی پێغەمبەران نیم.. واتە یەكەمجار نییە پێغەمبەرێكتان بۆ بێ، كە منم، بەڵكو بەر لە منیش پێغەمبەرانی تر هاتوون (دروودیان لەسەر بێ).. لە فەرموودەشدا هاتووە: (كل بدعة ضلالة).. واتە: هەموو تازەهێنراوێك گومڕاییە.

لە فەرهەنگەكانی زمانی كوردیشدا (جوانكار) بە دوو واتا دێت:

١- ڕازێنەوە، بووك جوانكەر

٢- دەست ڕەنگین، بە هونەر

هەرچی (جوانكاری)شە، ناوێكی واتاییە، پێكهاتووە لە ئاوەڵناوی بكەری لێكدراوی (جوانكار) و (ی)، كە وەك پاشگرێكی دروستكردنی ناوی واتایی هاتۆتە سەر (جوانكار)ی ئاوەڵناو و، (ناوە واتایی)یەكەی لێ دروست كردووە، كە (جوانكاری)یەو بەسەریەكەوە واتە: ئەو كارە جوانانەی هەر كەسێك لە بواری پسپۆڕی خۆی ئەنجامیان دەدات.. بەڵام لە (ڕەوانبێژی)دا لای كورد و عەرەب (جوانكاری) واتایەكی تر دەگەیێنێ، ئەویش: ئەو زانستەیە كە ڕووە جوانەكانی دەربڕینی پێدەناسرێتەوە، دوو جۆری هەیە:

١- جوانكاری واتایی

٢- جوانكاری وشەیی

# بەشی یەکەم

# شێوازەکانی جوانکاری وشەیی

### رەگەزدۆزی:

رەگەزدۆزی (الجناس).. بریتییە لە بوونی دوو وشە لە دەربڕیندا لێکچووبن و لە واتادا جیاوازبن.. یان بە واتایەکی تر: راستییەتی رەگەزدۆزی ئەوەیە، دوو وشە دەربڕاوەکان یەکبن، یان هاوشێوە و یەکچووبن، واتاشیان جیاوازبێت.. ئەمەش دوو جۆری هەیە، بریتینە لە: رەگەزدۆزی تەواو و رەگەزدۆزی ناتەواو.

### جۆرەکانی رەگەزدۆزی:

ئەگەرچی رەوانبێژان و زانایانی (جوانکاری)، بە تایبەت لە عەرەبیداو هەروەها لە کوردیش دابەشین و بەدواداچوونی زۆریان کرد بێ و تا رادەیەك بابەتەکەیان فراوانکردبێ، بەڵام نزیکترین دابەشین لە راستییەتی بابەتەکە ئەوەیە، کە: رەگەزدۆزی دوو جۆری سەرەکی هەیە:

١- رەگەزدۆزی تەواو: بریتییە لەوەی ئەو دوو وشەی رەگەزدۆزییەکە دروست دەکەن، لە چوارشتدا یەکبن، ئەوانیش: جۆری پیتەکان، ژمارەیان، شێوەیان، ریزبوونیان.

٢- رەگەزدۆزی ناتەواو: ئەمەش ئەوەیە، کە یەکێ لەو دوو وشەیەی رەگەزدۆزییەکە دروست دەکەن، لە یەکێ لەو چوار مەرجانەی رەگەزدۆزی تەواوی لەسەر دادەمەزرێ جیاوازبن، یا ئیتر لە سێ یان دوو شتی دیکەشیان لێکچووبن.

### یەکەم: رەگەزدۆزی تەواو

ئەمە وەك خرایەڕوو، بریتییە: لە بوونی دوو وشە، لە شێوەدا وەك یەك و لە واتادا جیاوازبن.. ئەمەش جوانییەکی گەورە و چێژێکی خۆش بە خوێنەر و پێش ئەو بە شاعیریش

دەبەخشێت، چونکە هەستی کردووە فەرهەنگی وشەکانی دەوڵەمەندە و بێ تەئەموول وەکو (نالی) دەڵێت: لە مەیدانی فەصاحەتدا زوبانی رادەکا.. بۆیە شاعیر نییە بایەخی پێنەدابێت و ئەوەندەی بۆی کرابێت، سوودی لەو هونەرە وەرنەگرتبێت بۆ جوانکردن و بەهێزکردنی شیعرەکانی.. بۆ نموونە:

ـ نالی نییەتی سیخری بەیان حیکمەتی شیعرە

ئەمما نییەتی قووەتی دڵ قودرەتی ئینشا... نالی

(نییەتی) لە نیوە دێڕی یەکەم، واتە (مەبەستی)، پێکهاتووە لە (نییەت)ی عەرەبی و (ی) راناوی لکاوە، (نییەتی) دووەم فرمانی ناتەواوی (نییە)یە لەگەڵ (ت)ی ناوگر و (ی) راناوی لکاو، هەردوو (نییەتی)یەکان لە هەموو روویێکەوە وەکو یەکن، بەڵام لە واتادا هەریەکەو واتای تایبەت و سەربەخۆیان هەیە، بەوەش رەگەزدۆزی تەواو دروست بووە.

ـ دوێنێ چ بوو دەتدا بە زوبان لافی کەرامەت

ئەمرۆ نەدەمت بوو نەدەمت بوو نەدەمت بوو... نالی

لە نیوە دێڕی دووەمدا (نالی) سێ جار وشەی (نەدەم)ی هێناوەتەوە، لە جاری یەکەمدا پێکهاتووە لە (نە)ی ئامرازی نەفی لەگەڵ (دەم)، کە بە واتای (سەردەم) دێت.. لە جاری دووەمدا پێکهاتووە لە (نە)ی ئامرازی نەفی لەگەڵ (دەم)، کە بە واتای (دەوی ئادەمیزاد) دێت، هەردوو ئەم وشانە کوردینە، لە جاری سێیەمیش (نەدەم) وشەیەکی عەرەبییە بە واتای (پەشیمانی) دێت.. بەسەریەکەوە واتای دێڕەکە ئەوەیە، کە (نالی) گلەیی لە یەکێك لە خۆبەزلزانەکانی دوێنێ دەکات، پێی دەڵێت: دوێنی بە زوبان بە خۆت دا دەگوت و شانازیت بە شان و شەوکەتی خۆتەوە دەکرد! بەڵام ئەمرۆ کە سەردەمت بەسەرچوو، دەم و زمانت نەما وەکو جاران بەرگری لە خۆت بکەیت و شانازی بەخۆتەوە بکەیت، وات لێهات لە پەشیمانیدا کەوتی!

ـ ئەگەر خاڵت بلێم میشکی خەتایە

عەزیزی من ئەمەم عەینی خەتایە... حاجی قادری کۆیی

(خەتا) لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم هاتووە و لە کۆتایی دێڕەکەش هێنراوەتەوە، هاوشێوەنە، بەڵام هاوواتا نینە. چونکە:

خەتای یەکەم: شارێکە لە وڵاتی چینی کۆن.. خەتای دووەم: واتە هەڵە و تاوان.. (رەگەزدۆزی تەواو)ە.

- وەرە لادە لە دونیا بێ لەمەولا رووت لە مەولا بێ
دڵ و جان و وجوودت هەر نیساری شاهی (لەو لا) بێ... سەید ئەحمەدی نەقیب

(لەمەولا)ی یەکەم بە واتای لەم رۆو بەدواوە.. (لە مەولا)ی دووەم، واتە: روو لە خودا بـکە، کە مەولا و پشتیوانی ئیماندارانە.. دوو وشەکان لە رووخساردا وەکو یەك و لە واتادا لێك جیاوازن، بەوەش (ڕەگەزدۆزی تەواو) بەرهەم هاتووە.

- تا داخلی خەلوەت دەبی ئەمجا بە وەکالەت
خاکی قەدەمی ماچ بکە بەم تەرزە کە تەرزە... حاجی قادری کۆیی

(تەرزە) لە ناوەڕاستی نیوە دێـڕی دووەم هـاتووە و لـە کۆتـایی دێڕەکـەش هێنراوەتـەوە، هاوشێوەنە، بەڵام هاوواتا نینە.. چونکە: تەرزەی یەکەم: واتە جۆر بەم تەرزە، واتە بەم جۆرە.. تەرزەی دووەم: واتە باش، کە تەرزە، واتە: کە باشە.. (ڕەگەزدۆزی تەواو)ە.

- ئەتۆ لەلای خۆت خاوەن پێڕەوی
کەچی دەبینم سەگت پێ ڕەوی... سامی عەودال

(پێڕەوی) جاری یەکەم بە واتای بەرنامە و جاری دووەم بـە واتـای پێـت رەوینـی سـەگ هاتووە، رەگەزدۆزی تەواوە.

- گەر چڵکن نەبی لاشەت ناخورێ
زەنگینیش نەبی ماڵت ناخورێ... سامی عەودال

(ناخورێ) جاری یەکەم بە واتای خورشتی نابێ و نـاخورێ، جـاری دووەمـیش بـە واتـای خواردن دێ ، رەگەزدۆزی تەواوە.

### جۆرەکانی رەگەزدۆزی تەواو:

دیارە جۆرەکانی رەگەزدۆزی تەواویش بـە رەچـاوکردنی ئـەم دوو وشـەیەی (رەگەزدۆزییـە تەواو)ەکە دروست دەکەن، چەندانێکن، لەوانە:

### ١- رەگەزدۆزی تەواوی نێوان (ناو) و (فرمان) بۆ وێنە:

- ئەوەی ڕێگەی لە کوردەکان گۆڕی
لەعنەتی خودا لە ئەلحەد و گۆڕی.. مەلای گەورە.

(گۆڕی) دوو جار هاتووە، لە ڕواڵەتدا هەردوو جار وەکو یەکە، بەڵام لە واتادا هەر جارەی واتایەکی سەربەخۆی هەیە، جاری یەکەم بە واتای (گۆڕین و سەرلێتێکدان) هاتووە، (فرمانی رابردووە)، جاری دووەمیش بە واتای (قەبر) هاتووە (ناو)ە!

**٢- ڕەگەزدۆزی تەواوی نێوان دوو (ناو)، بۆ وێنە:**

ـ لە دنیا هەر کەسێ مەقصودی عیشقە

بکا وەك من بە کوللی تەرکی دنیا... حاجی قادری کۆیی

(دنیا) لە ناوەڕاستی نیوە دێڕی دووەم هاتووە و لە کۆتایی دێڕەکەش هێنراوەتەوە، هاوشێوەنە، بەڵام هاوواتا نینە، چونکە (دنیا)ی یەکەم (ناو)ەو شوێنی تیا ژیانە، (دنیا)ی دووەمیش هەر (ناو)ە، بەڵام بە واتای خۆشییەکانی دنیا دێت، (ڕەگەزدۆزی تەواو)ە.

**٣ـ ڕەگەزدۆزی تەواوی نێوان (ناو) و (ئاوەڵناو):**

جا دەشێ هەندێجار (ناو)ەکە پێش (ئاوەڵناو)ەکە بکەوێ و هەندێ جاری دیکەش بە پێچەوانەوە، (ئاوەڵناو)ەکە بە پێش (ناو)ەکە بکەوێ.. بۆ نموونە:

ـ هەرچەندە کە ڕووتم بە خودا مایلی ڕووتم

بێ بەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە... نالی.

لە نیوە دێڕی یەکەم دووجار وشەی (ڕووت) هاتووە، یەکەمیان (ئاوەڵناو)ە، بە واتای (بێ جل و بەرگی) هاتووە.. دووەمیان (ناو)ە بە واتای (دەموچاو و ڕووی جوانی تۆ) هاتووە! بەمەش ڕەگەزدۆزی تەواو دروستبووە.

جاری وەهاش هەیە بە گوێرەی تێگەیشتنەکان شوێنی (ناو)و (ئاوەڵناو)ەکە لە یەك دێڕدا گۆڕانیان بەسەردا دێت، بۆ نموونە:

ـ تاڵ و شیرین پێکەوە نەمدیوە چابێ چانەبێ

هەر کەسێکی هەمنشینی چانەبێ پێت چانەبێ... مەلا صاڵحی حەریق.

لەم دێڕەدا چوار جار وشەی (چا) هاتووە، کە هەر جارەی بە واتایەك هاتووە، ئەمەش وادەکات بەلانی کەم دوو لێکدانەوە بۆ دێڕەکە بکرێت:

یەك: ئەگەر لە نیوە دێڕی یەکەم وشەی (چا)ی یەکەم ئاوەڵناوی (چاك) بێت و وشەی (چا)ی دووەم (چایە)ی خواردنەوە بێت، واتە (ناو) بێت، ئەوا واتای نیوە دێڕی یەکەم بەو

شێوەیە دەبێت: نەمدیوە دوو شتی یەك تاڵ و ئەوی تر شیرین پێکەوەبێ، باش بێت، بە تەنیا (چایە) نەبێت، کە لە تۆ چایەو شەکر پێکدێت، یەکەمیان تاڵە و دووەمیان شیرینە و بە تێکەڵکردنیشیان شتێکی باش و نایاب دروست دەبێت!

دوو: ئەگەر لە نیوە دێڕی یەکەم وشەی (چا)ی یەکەم (چایە)ی خواردنەوە بێت، واتە (ناو) بێت و وشەی (چا)ی دووەم ئاوەڵناوی چۆنیی (چاك)ی بێت، ئەوا واتای نیوە دێڕی یەکەم بەو شێوەیە دەبێت: چایە چ تاڵ بێت و چ شیرین، واتە چ بە تاڵی بخورێتەوەو چ بە شیرینی، نەمزانیوە خراپ بێت و هەمیشە هەر باشە!

لە هەردوو باریشدا نرخ و بەهای (چایە) مەبەستە و جێی سەرسوڕمان و خۆشەویستی شاعیرە!!

ئەوە تا ئێرە تایبەت بە نیوە دێڕی یەکەم، خۆ ئەگەر ئەو حسێبە وردە بۆ (چا)یەکانی نیوە دێڕی دووەمیش بکەین و لە جارێکەوە بۆ جارێکی تر تێگەیشتنمان بۆیان جودا بێت، ئەوا واتای دێڕەکە فراوانتر و جوانتریش دەبێت.

ـ ئومێدی سەر لە سەر دەرکەن ئەوانەی ڕاست و ڕووناکن
قەڵەم هەر سەر قەڵەم مۆم بۆ مقەست هەر بۆ ئەویش چاکن... پیرەمێرد.

دوو وشەی (سەر) لە نیوە دێڕی یەکەمدا هاتووە، لە هەموو ڕوویێکەوە لە ڕواڵەتدا تەواو وەکو یەکن، بەڵام لە ڕووی واتاوە: یەکەمیان بە واتای (سەرکەوتن) و دووەمیان بە مانای (مێشك) هێنراون.

ئەوەی لێرەدا جێی ئاماژە بۆ کردنە، گەلێ جار دوو وشەکان یەکیان بە یەکپارچەیی و ئەوی تریان بە دوو پارچەیی دێن، بەڵام لەمەشدا چ زیانێك نییە ئەگەر هەردوو وشەکان بە یەکپارچەیی هاتبن، یان یەکیان یەك پارچە و ئەوی تریان بە دوو پارچەیی هاتبێت، چونکە گرنگ ئەوەیە لە چوار مەرجە سەرەکییەکانی ڕواڵەتیاندا بە یەکتری یەکسانبن، بۆیە هەندێکی ڕەوانبێژان ئەوە بە گرنگ نابینن، هەندێکی تریش بۆ هەریەکەیان ناوێك بەکاردێنن، واتە: ئەگەر دوو وشەکان هەردووکیان یەك پارچە بوون، ناوێکی لێدەنێن و ئەگەر دوو وشەکان یەکیان یەکپارچە و ئەوی تر دوو پارچەبوو ناوێکی تری لێدەنێن.

ـ چەند ساڵە ئاشنای شەوی بێداری یەکترین
وەك سەرسەرین، شەوێ سەر ناکەینە سەر سەرین... پیرەمێرد.

(سەرسەرین) لە نێوەی دێڕی دووەمدا کە بەسەریەکەوە هاتووە، واتە: کەسێکی سەرسەری و بەدڕەوشت، لە دواتریشدا هەر لەو نیوە دێڕەدا وشەی (سەر سەرین) هاتووە، کە دوو بەشـە، بەشی یەکەمی (سەر) بە واتای رووی سەرەوەی شت و بەشی دووەمیشی (سـەرین) بـە واتـای (بالیف) هاتووە، بەڵام لە رووالّەتـدا چ جیاوازییـەکیان نییـە، بۆیـە (ڕەگـەزدۆزی تـەواو)یان دروست کردووە.

ـ سەرداری ئێمە بوو کە لەسەر دار بە پێکەنین

بانگی ئەکرد: بە کوشتنی من میللەتم ئەژین... پیرەمێرد.

لەم نموونەیە دوو وشەی (سەردار) و (سەر دار) هاتوون، یەکەمیان بەسەریەکەوەیە، واتـە: (سەرکردە و پێشەوا)، دووەمیشیان بە دوو پارچەیی هاتووە، پارچەی یەکەمی (سەر) بە واتای رووی سەرەوەی شت و بەشی دووەمیشی (دار) هەر بە واتای (دار) هاتووە، کە بەسەر یەکەوە بە واتای (سێدارە) دێن، بەڵام لە رووالّەتدا چ جیاوازییەکیان نییە، بۆیە (رەگەزدۆزی تەواو)یان دروست کردووە.

### دووەم: رەگەزدۆزی ناتەواو

بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە یەك، یان زیاتر لـە مـەرجێکی (ڕەگـەزدۆزی تـەواو) لـە دەست دەدات، واتە: بەشێکی گرنگی (رەگەزدۆزی)یە، لە دوو وشە پێکدێت، کە تـا رادەیـەك لێکچوون لە نێوانیاندا هەبێت، بەڵام لێکچوونەکە تەواونەبێت، لە واتاشدا هەردوو وشەکان لە یەکتری جیاوازبن و هەریەکەو واتای سەربەخۆی خۆی هەبێت، ئەوەش زیاتر لە جۆرێکی هەیە، وەکو (جودا و کەرتی و زیاد و پێچەوانەیی و هاوکێشی و... هیدیکە).. لەوانە:

### ١ـ رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا

بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە ژمارەو شێوەی ریزبوونی پیتەکانیان وەك یەك بێ، بەڵام لە یەکێ لە پیتەکانیان لە یەکتری جیاواز بن، بۆ نموونە:

ـ مەرحەبا ئەی خۆشەویستی خوای جەلیل

مەرحەبا ئەی صاحبی وەصفی جەمیل... رەشاد موفتی

(جەلیل) و (جەمیل) تەنها لە پیتی سێیەمیان لە یەك جیاوازن، کە لە یەکەمیاندا (ل) و لە دووەمیاندا (م)ـە. ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جـۆری (جـودا)ی بەرهـەم هێنـاوە، کـە

ئەوەش جوانییەك بە دێڕەكە دەبەخشێت و وا دەكات ناسكی و كاریگەرییەكی جوان بەرهەم بێت.

ـ ئەی ساكینی ریبازی مەدینەی منەووەڕە

لوتفێ بكە، بفەرموو، مەدینەی منەووەرە.. نالی.

(مەدینەی منەووەڕە) و (مەدینەی منەووەرە) تەنها لە پیتی (ر)ی پێش كۆتاییان لە یەك جیاوازن، كە لە یەكەمیاندا (ڕ)ی قەڵەو لە دووەمیاندا (ر)ی سووكە. ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا)ی بەرهەم هێناوە، چونكە پیتەكان یەك رووخسار و شێوەیان هەیە، بەڵام لە یەكەم بۆ دووەم (حەوت)ێك زیاد یان كەم دەكات، ئەوەش جوانییەك بە دێڕەكە دەبەخشێت و وا دەكات ناسكی و كاریگەرییەكی جوان بەرهەم بێت.

ـ گەر ڕەفیقت یاری صادق بێ چ باكی ڕێگەتە

گەر كەسی بەدخوت لەگەڵدا بێ جەهەننەم جێگەتە... جەنەڕاڵ ئەمین فەیزی بەگ

(ڕێگە) و (جێگە) رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا بەرهەم دێنن، چونكە لە تەنیا پیتی یەكەمیان لێكتر جودابوونەتەوە، دەنا لە هەموو رووێكەوە پیتەكانی دیكەیان وەكو یەكە.

ـ میر بە سەد منەت هەناردی ئێسترێكی ڕووت و قووت

دەست و پا سست و سەقەت ئەندامی هەروەك عەنكەبووت... شێخ رەزا

وشەكانی (رووت) و (قووت) لە پیتی یەكەمیان لە یەكتری جیانە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا)ی بەرهەم هێناوە، چونكە لەو پیتەی لە یەك جیاوازن، پیتەكە لە وشەی یەكەم شێوەیەك و لە وشەی دووەم شێوەیەكی دیكەی هەیە، شێوەكان لە یەكتری جیاو سەربەخۆنە.

ـ هەموو پێغەمبەران حەققن بەبێ ڕەیب

هەموو مەعصوم و چاك و پاك و بێ عەیب... سەید ئەحمەدی نەقیب

وشەكانی (ڕەیب) و (عەیب) هەردووكیان پێنج پیتن و چوار پیتیان وەكو یەكە، بەڵام لە پیتی یەكەمیان لە یەك جیانە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا)ی بەرهەم هێناوە.

ـ بە بیرت دێ زەمانێ چووینە باڵەك

بە پێخواسی نە كەوشم بوو نە كاڵەك... حاجی قادری كۆیی

وشەكانی (باڵەك) و (كاڵەك) هەردووكیان پێنج پیتن و چوار پیتیان وەكو یەكە، بەڵام لە پیتی یەكەمیان لە یەك جیانە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا)ی بەرهەم هێناوە.

ـ لە تەئریخا ئەڵێت بازێ بە بازێ

وتی تاکەی بژین بێ قەدر و نازێ... مینە جاف

وشەکانی (بازێ) و (نازێ) هەردووکیان پێنج پیتن و چوار پیتیان وەکو یەکە، بەڵام لە پیتی یەکەمیان لە یەك جیانە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا)ی بەرهەم هێناوە.

ـ هەتاکەی وێڵی سەحراو دەشت و کێوان

هەتاکەی بێ تەقاڵای رزق و شێوان... مینە جاف

وشەکانی (کێوان) و (شێوان) هەردووکیان پێنج پیتن و چوار پیتیان وەکو یەکە، بەڵام لە پیتی یەکەمیان لە یەك جیانە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا)ی بەرهەم هێناوە.

ـ سبەینان ڕاتبەیان دۆشاو و ماست بوو

بەڵام ئێوارە چێشتێکی بە ڕاست بوو... حەیدەری

وشەکانی (ماست) و (ڕاست) هەردووکیان پێنج پیتن و چوار پیتیان وەکو یەکە، بەڵام لە پیتی یەکەمیان لە یەك جیانە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا)ی بەرهەم هێناوە.

ـ هەوارە و هەوار هەر داخ وە کۆڵ بای

چوون مەجنون داییم وامەندی چۆڵ بای... مەجزوب

وشەکانی (کۆڵ) و (چۆڵ) هەردووکیان سێ پیتن و دوو پیتیان وەکو یەکە، بەڵام لە پیتی یەکەمیان لە یەك جیانە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (جودا)ی بەرهەم هێناوە

ـ ئەجەل فرسەت بدا بەم یەئسە حەمدی عەینی ئومێدە

کە زەحمەت رەحمەتی هێناوە هیجرەت بۆ مولاقاتە... حەمدی.

وشەکانی (زەحمەت) و (ڕەحمەت) لە پیتەکانی (ز) و (ڕ)دا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارەو ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ بێ حیسابە شین و ڕۆیە، ئەسرینم جۆباری جۆیە

مەقسەدم هەر زاتی تۆیە، ئەی شەهی ڕۆژی حیساب... ئەحمەدی کۆر

وشەکانی (جۆیە) و (تۆیە) لە پیتەکانی (ج) و (ت)دا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارەو ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ ئەووەل و ئاخر ئەتۆی ئەی زاتی پاك

نەوعی ئینسانت دروستکرد تۆ لە خاك... رەشاد موفتی

وشەکانی (پاك) و (خاك) لە پیتی یەکەمیان (پ) و (خ)دا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارەو ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ چ سەوداییێکە وا یاران کە بیٚ سەودا لە سەرمایە

غەم و تەم میحنەت و هیجران وەکو خەرقە لە بەرمایە... میرزا غەفور

وشەکانی (لە سەرمایە) و (لە بەرمایە) لە پیتی سێیەمیان (س) و (ب)دا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارە و ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ لەویٚ ڕۆژیٚ کە تۆ خولقای، هەموو عالەم بە تۆ مایل

دەکەن ئەرجوو و تەمەننایە لە دەرگاهت وەکو سایل

چ موشتاقن ببین ڕوویی تۆ بیٚ پەردە و بیٚ حایل... ئەحمەدی کۆر

وشەکانی (مایل) و (سایل) و (حایل) لە پیتەکانی (م) و (س) و (ح)دا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارەو ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ ئاخر زەمانە و دنیا بازی یە

ئیمان زاییفە و شەیتان ڕازی یە... کاکە حەمە عەلی رەحیم پوور

وشەکانی (بازی) و (ڕازی) لە پیتەکانی (ب) و (ڕ)ی سەرەتایاندا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارەو ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ داییم ئامادەس بۆ ماڵ و سامان

جاریٚ نایێژیٚ خوا تۆبە ئامان... کاك حەمە عەلی رەحیم پوور

وشەکانی (سامان) و (ئامان) لە پیتەکانی (س) و (ئـ)ی سەرەتایاندا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارە و ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ باری پەژارە لە جیٚ بزەی لێو

خەم لەسەر دڵی بە بارسایی کێو...ئەحمەدی موفتی زادە

وشەکانی (لێو) و (کێو) لە پیتەکانی (لـ) و (کـ)ی سەرەتایاندا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارە و ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

ـ ئەی گرتە باوەش بە سەد نازەوە
بە دواندن و بە دەم ڕازەوە...ئەحمەدی موفتی زادە
وشەکانی (نازەوە) و (ڕازەوە) لە پیتەکانی (نـ) و (ڕ)ی سەرەتایاندا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارە و ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.
ـ کەوتەوە بیری ئاواتی کۆنە
ئاخ بیزانیایە بزەی باوك چۆنە...ئەحمەدی موفتی زادە
وشەکانی (کۆنە) و (چۆنە) لە پیتەکانی (کـ) و (چـ)ی سەرەتایاندا، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارە و ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی جودا دروست بووە.

## ٢ـ رەگەزدۆزی ناتەواوی رەها

ئەو رەگەزدۆزییەیە، کە دوو وشەکانی لە ژمارە و شێوە و ریزبوون و جۆری پیتەکانیان دەشێ لێکجیابن، بەڵام هەردووکیان یەك رەگیان هەیە.. بۆ وێنە:
ـ فاتیحەی لادێ ماڵ بەقوڕ دەگرێ
مردوو بە ڕێی خۆی، زیندووی پێ دەمرێ... موفتی پێنجوێنی.
لە نیوە دێڕی دووەم، وشەکانی (مـردوو) و (دەمـرێ)، هەرچـەندە شـێوەو ریزبـوون و جـۆری پیتەکانیشیان لێکجیایە، بەڵام هەردووکیان یەك رەگ و سەرچاوەیان هەیـە، ئـەویش چـاوگی (مردن)ە، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی رەها دروستبووە.
ـ ئەمە بە خوێندنەوەی یەك قەسیدەی بوردەیە
کە بۆم بخوێنییەوە پڕ لە شەوق و زەوق و صەفا... چروستانی
لە نیوە دێڕی یەکەم، وشەی (خوێندنەوە)، لە نیوە دێڕی دووەمیش وشـەی (بخوێنییـەوە)، هەرچەندە شێوە و ریزبوون و جۆری پیتەکانیشیان لێکجیایە، بەڵام هـەردووکیان یـەك رەگ و سەرچاوەیان هەیە، ئەویش چاوگی (خوێندن)ە، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی رەها دروستبووە.

## ١ـ رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد

بریتییە لەو رەگەزدۆزییەی، کە دوو وشەکانی، لە جۆر و شێوە و ریزبوونی پیتەکانیان یەك بن، بەڵام ژمارەی پیتەکانیان ئەوەندەی یەکتر نەبن، یەکێکیان پیتێك، یان دوو پیتی لەوی تر زیاتربێت.. ئەمەش دوو جۆری هەیە:

یەك: بە گوێرەی زیاتری پیتەکانی وشەیەك لەگەڵ وشەکەی تر:

دەشێ دوو وشەکان بە یەك پیت، یەکیان لە ئەوی تر زیاتر بێت، بۆ وێنە:

ـ صەد دروود ئەی ڕوومەتت شەمعی شەبووستانی (وجوود)

صەد دروود ئەی قامەتت سەروی بەهارستانی (جوود)... مەولانا خالیدی نەقشەبەندی، و: پیرەمێرد

وشەی (وجوود) بەپیتی یەکەمی کە (و)ە، لە وشەی (جوود) زیادە.. ئەگینا جۆر و ژمارە و ریزبوون و شێوەی پیتەکانی تریان وەك یەکە، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد دروست بووە.

ـ ئەگەر جورعەی ڕەقیبت لا گوڵاوە

نەکەی بیخۆیەوە پیس و گڵاوە... حاجی قادری کۆیی.

وشەی (گوڵاوە) بەپیتی دووەمی کە (و)ە، لە وشەی (گڵاوە) زیادە.. ئەگینا جۆر و ژمارە و ریزبوون و شێوەی پیتەکانی تریان وەك یەکە، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد دروست بووە.

جاری واش هەیە ئەم دوو وشەیەی ئەو شێوە (زیاد)ەی (رەگەزدۆزی ناتەواو)ە دروست دەکەن، یەکێکیان بە دوو پیت لەوەی تر زیاتر دەبێت، بۆ وێنە:

ـ حەیفە بۆ مەردی صاحیبی تەمیز

هێندە باسی مەکانی پیسی و میز... جاجی قادری کۆیی

لە نێوان دوو وشەکانی (تەمیز) و (میز)، (زیاد)ییەك هەیە، کە ئەویش دوو پیتەکانی (ت) و (ە)نە لە وشەی یەکەم، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد دروست بووە.

هەندێ جاری تریش ئەم دوو وشەیەی (زیاد)ییەکە دروست دەکەن، یەکیان لە ئەوی تر بە سێ پیت زیاترە، بۆ وێنە:

ـ ڕەسمێکی قەدیمە دەوری گەردوون

خەصمی نوجەبایە، هەمدەمی دوون... حاجی قادری کۆیی.

وشەی (گەردوون) بە سێ پیت لە وشەی (دوون) زیاترە، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد دروست بووە.

دوو: بە گوێرەی ئەو شوێنەی لە یەکێ لە وشەکاندا لە چاو ئەوی تر، (زیاد)ی دروست دەبێت، دوو جۆرمان لەم شێوە (زیاد)ەی رەگەزدۆزی ناتەواو هەیە، ئەوانیش:

یەك: دەشێ زیادییەکە بکەوێتە سەرەتای یەك لە وشەکان.. وەکو:

ـ ماجەڕاییێکم هەیە بێ بێش و کەم

هیچ درۆی تێدا نییە، بابۆت بکەم... حاجی قادری کۆیی.

وشەی (بکەم) بە یەك پیتی (ب)ی سەرەتای، لەگەڵ وشەی (کەم)، (رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد)ی دروست کردووە.

دوو: جاری وەهاش هەیە پیتە زیادەکان دەکەونە ناوەڕاستی یەك لە وشەکان.. وەکو:

ـ بنووارە بوونی ئەووەلت و چوونی ئاخیرت

هاتی چ ڕووت و قووت و هەڵاتی چ لووس و پووس... نالی

وشەی (هەڵاتی) بە دوو پیتی (ە، ڵـ)ی ناوەڕاستی لە وشەی (هاتی) زۆرترە، بەوەش (رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد)ی دروست کردووە.

ـ یەك بە سەد ئەجری هەیە هەر ئیشی باش

با نەچێ وەقتت بە بێهودە و بەلاش... رەشاد موفتی

وشەی (بەلاش) بە دوو پیتەکانی (ە،ل)ی ناوەڕاستی لە وشەی (باش) زۆرترە، ئەوەش(رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد)ی دروست کردووە.

ـ تەبلیغات ئەکەن خوەیان هەن لە دوور

وە کار وەدەستان خاس ئەدەن دەستوور... کاکە حەمە عەلی رەحیم پوور

وشەی (دەستوور) بە سێ پیتەکانی (ە،س،ت)ی ناوەڕاستی لە وشەی (دوور) زۆرترە، ئەوەش(رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد)ی دروست کردووە.

ـ تۆ نەبی دەردمان دەرمان کەی ئیتر

بۆمان نەماوە تەدبیرێکی تر... ئەحمەدی موفتی زادە

وشەی (دەردمان) بە یەك پیتی (د)ی ناوەڕاستی لە وشەی (دەرمان) زۆرترە، ئەوەش(رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد)ی دروست کردووە.

- ئەی ئەو کەسانەی چاوتان دەبینی
بۆچی بە وردی نانۆڕنە دینی... سامی عەودال
وشەی (دەبینی) بە دوو پیتی (ە،ب)ی ناوەڕاستی لە وشەی (دینی) زۆرترە، ئەوەش(رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد)ی دروست کردووە.

سێ: جاری وەهاش هەیە پیتە زیادەکان دەکەونە کۆتایی یەك لە وشەکان.. وەکو:
- زیندەگی وەها وەك ژەهر مارە
ئەوە زەمانەی دین و دینارە... کاکە حەمە عەلی رەحیم پوور
وشەی (دینار) بە دوو پیتی (ا - ر)ی کۆتاییی، لەگەڵ وشەی (دین)، (رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد)ی دروست کردووە.
چوار: جاری وەهاش هەیە پیتە زیادەکان دەکەونە ناوەڕاست و کۆتایی یەك لە وشەکان.. وەکو:
- تەیبە کە یەعنی ڕۆژ و شەوی تیبی عالەمە
ڕۆژی کە وشکە شەو تەڕە کافوری عەنبەرە... نالی
وشەی (تەیبە) بە پیتی (ە)ی پیتی دووەمی ناوەڕاستی و (ە)ی پیتی پێنجەمی کۆتاییی لەگەڵ وشەی (تیب)، (رەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد)ی دروست کردووە.

### ٤- رەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی

بریتییە لە بوونی دوو وشە، ئەگەرچی زۆربەی پیتەکانیشیان لەیەکجیابێ، بەڵام لەسەر یەك کێش بن.. بۆ وێنە:
- موئمینین دائیم دەکەین تەحمیدی تۆ
زۆر بە دڵخۆشی دەکەین تەوحیدی تۆ... رەشاد موفتی
وشەکانی (تەحمیدی) و (تەوحیدی) ئەگەرچی دوو پیتی سێیەم و چوارەمیان یەك نەبن، بەڵام لەسەر یەك کێشن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی دروستبووە.
- هەر کەسێ بڕوا بە گوێڕەی ئەمری وی
هیچ نەترسێ، سەهلە ڕێگە و حەشری وی... رەشاد موفتی

وشەکانی (ئەمری) و (حەشری) ئەگەرچی دوو پیتی یەکەم و سێیەمیان یەك نەبن، بەڵام لەسەر یەك کێشن، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی دروستبووە.

ـ زەکاوەت کانییێکە، تۆی دەراوی
خەتی ئیقراری نووسیوە زەهاوی... حاجی قادری کۆیی.

وشەکانی (دەراوی) و (زەهاوی) ئەگەرچی دوو پیتی یەکەم و سێیەمیان یەك نەبن، بەڵام لەسەر یەك کێشن، بەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی دروستبووە.

ـ مەگری مەناڵە با بە خەفەت دڵشکست نەبن
نەختیێ لە لات ئەمێننەوە بۆ بەهەشت ئەچن... پیرەمێرد.

(نەبن) و (ئەچن) هەردووکیان چوار پیتن و لەسەر یەك کێشن، بەڵام لە پیتەکانی یەکەم و سێیەمیان لە یەکتری جیاوازن، بەمەش (ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی)یان دروست کردووە.

ـ مەڵێ فەقیرم کوفری نیعمەتە
لەشساغی بۆ تۆ موڵك و سەروەتە
پیاوی تەوەزەل لات و نەگبەتە
قۆڵی لیێ هەڵکە بچۆرە کایە
سەری بیێ ڕۆژی لەژێر خاکایە... بێکەس.

وشەکانی (سەروەتە) و (نەگبەتە) هەریەکە و واتای سەربەخۆی هەیە، لە پیتی یەکەم و سێیەمیان لە یەکدی جیاوازن، بەڵام لەسەر یەك کێشن، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (هاوکێشی)ی دروست کردووە.

ـ ئەو هەمدەمی غەمخوار و نەدیمی منە یا ڕەب
ئەو مەحرەمی ئەسرار و قەدیمی منە یا ڕەب
ئەو گەوهەری شەهوار و یەتیمی منە یا ڕەب
کەوتۆتە چ بەحرێکەوە خنکاوە دڵی من... بێخود.

وشەکانی (نەدیمی) و (قەدیمی) ڕەگەزدۆزی ناتەواوی جودا و لەگەڵ وشەی (یەتیمی)ش لە دوو پیتی یەکەم و سێیەم لێکجیاوازن، هەریەکەو واتای سەربەخۆیان هەیە، بەڵام لەسەر یەك کێشن، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (هاوکێشی)ی دروست کردووە.

ـ دەردی محەمەد دیسان دیویاوە

زامی کۆنە و نۆ هەمووی کولیاوە...ئەحمەدی موفتی زادە

وشەکانی (دیویاوە) و (کولیاوە) هەریەکەو واتای سەربەخۆی هەیە، لە پیتی یەکەم و سێیەمیان لە یەکدی جیاوازن، بەڵام لەسەر یەك کێشن، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (هاوکێشی)ی دروست کردووە.

ـ سەلامی من لە جەمعی ساکنی مەئموری مەعمورە

لە سایەی ئیلتسفاتی ئێوە میرزا شاد و مەسرورە... میرزا غەفور

وشەکانی (مەعمورە) و (مەسرورە) لە پیتەکانی سێیەم و چوارەمیان، لێکتر جیابوونەتەوە، دەنا ژمارە و ریزبوونی پیتەکانیان وەکو یەکن، بەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی دروست بووە.

ـ وا چەتری هەڵدا گوڵی هەناران

وەرنە تەماشای فەسڵی بەهاران... سامی عەودال

وشەکانی (هەناران) و (بەهاران) هەریەکەو واتای سەربەخۆی هەیە، لە پیتی یەکەم و سێیەمیان لە یەکدی جیاوازن، بەڵام لەسەر یەك کێشن، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (هاوکێشی)ی درووست کردووە.

### ٥- رەگەزدۆزی ناتەواوی پێچەوانەیی

بریتییە لە هەڵگەڕاندنەوەی وشەیەك لە وشەکان، یان بە واتایەکی تر: ئەو دوو وشەیەی رەگەزدۆزییە ناتەواوە (پێچەوانەیی)یەکە دروست دەکەن، وشەی دووەمیان ریزی پیتەکانی پێچەوانەی ریزبوونی هەمان ئەو پیتانەیە، کە وشەی یەکەم پێکدێنن... بە واتە: بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە ژمارەی پیتەکان و جۆری پیتەکانیان وەکو یەکن، بەڵام شێوەی پیتەکانیان مەرج نییە وەکو یەك بن، ریزبوونی پیتەکانیشیان تەواو بە پێچەوانەی یەکن.. بۆ نموونە: وشەکانی: (حوور) و (رووح).. وشەکانی: (شەڕ) و (ڕەش).. وشەکانی: (کەو) و (وەك)و بەم شێوەیە.. بۆ نموونە:

ـ بۆچی وەك کەو جنسی خۆم راکێشمە ژێر داوی بەڵا

دانی گەنمی ناو قەفەز ناخۆم و گیاو گەپڵەم بەسە... پیرەمێرد.

وشـــەکانی (وەك) و (کــەو) دوو وشـــەنە، هــەردووکیان لــە رووەکــانی جــۆر و ژمــارەی پیتەکانیانەوە وەکو یەکن، بەڵام شێوەی پیتەکانیان تەواو وەکــو یــەك نییــە و پیتــی (ك) لــە وشەی (وەك) شێوەی کۆتایی هەیەو لە وشەی (کەو)یش شێوەی ســەرەتاو ناوەڕاســتی هەیــە، ریزبوونی پیتەکانیشیان تەواو پێچەوانەی یەکە، واتە هەردوو وشەکە لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی، یان لە کۆتایی بۆ سەرەتا بیانخوێنینەوە، جارێك بە (کەو) و جارێك بــە (وەك) دەخوێنرێنــەوە، بەوەش (رەگەزدۆزی ناتەواوی پێچەوانەیی) دروست بووە.

ـ فەرقی ناکەس لەگەڵ سەکان ناکەم

ها بە عـەکسی بخوێنەوە ناکەس... حاجی قادری کۆیی

لێرەدا دەبینین حاجی بە ئاشکرا دەڵێت: (ناکەس) و (سەکان) لەلای من وەکو یــەکن و چ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە، دەفەرموو هەریەکە لە وشەکان بە پێچەوانەوە بخوێنەوە، بزانــە وایە، یــان نــا ؟ لــە راستیشــدا وایــە، (ناکــەس) ئەگــەر لــە لای کۆتاییــەوەی بــۆ پێشــەوەی بخوێنرێتەوە، دەبێتە (سەگان)!! بە هەمان شێوە (سەگان)یش ئەگەر لە کۆتاییەوە بۆ سەرەتای بخوێنرێتەوە، دەبێتەوە (ناکەس)!!

ئەمە لە لایەك رەگەزدۆزی ناتەواو لە جۆری (پێچــەوانەیی) بەرهــەم دێنێــت، لەولاشــەوە لێکچوواندنێکی واتایی دروست دەکات و بە خوێنەر دەڵێت: مرۆڤی ناکەس وەکو سەگان وایە، کە دیارە وشەی (سەگان) پێکهاتووە لە ناوی (سەگ) و (ان)ی نیشانەی کۆ.

### ٦ـ رەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی

جۆرێکی دیکەی رەگەزدۆزی ناتەواوە، بریتییە لە بوونی دوو وشە، کە دووەمیــان کــەرتی یەکەمیانە، واتە: وشەی دووەم لە رووی ژمارەی پیتەکانەوە لــە وشــەی یەکــەم کــەمترە، کــە ئەوەش وابێت، کەوابێ واتای هەردوو وشەکەش لە یەکتری جیادەبنەوەو هەریەکەیان واتایەکی سەربەخۆی دەبێت، دیارە لێرەدا بە لای هەنــدێ لــە رەوانبێــژانی عــەرەب و کــوردیش مــەرج ئەوەیە وشەی کەرتکراو لە پێشەوەو ئەو کەرتە وشەی لێیشــی کراوەتــەوە راســتەوخۆ بــەدوای خۆیدا بێتەوە، بێ ئــەوەی هــیچ وشــەو دەســتەواژەیەك نێوانییــان بکــات. وەکــو بــۆ نموونــە: (شارستان شار جێناهێڵێ)، (باغەوان باغەکەی فرۆشت)، (دەنگخۆشەکە دەنگی نووســا)، لــە هەموو ئەو نموونانەی پێشوو دەبینین، هەمیشە کەرتە وشەی دووەم بە راستەوخۆیی لــە پــاش

کەرتی یەکەمی هاتووە و واتاشیان جیاو سەربەخۆیە، ئەوەتا لە نموونەی یەکەمدا: وشەی (شارستان) کە بکەرە و گوزارشت لەو کەسە دەکات، کە خەڵکی شارە، یان خاوەن بەهاو نەریتە ژیاری و شارستانییە بەرزەکانە، وشەی (شار)ی لێ کراوەتەوە، کە واتایەکی دیکەی هەیە و بریتییە لەو بازێڕە گەورەی دامەزراوەی جۆراوجۆر و دوکان و کۆشك و سەراو فەرمانگە جۆراوجۆرە خزمەتگوزارییەکان و شتانی دیکەی تیایەو بەوە لە گوند جیادەکرێتەوە.

لە نموونەی دووەمیش وشەی (باغەوان) ئاوەڵناوی بکەرە وەکو ناو و بکەر هاتووە، لە دوای خۆی وشەیەکی دیکەی لێ کراوەتەوە، کە ئەویش وشەی (باغ)ە، ناوی ئەو شوێنەیە، کە داری میوەجاتە جۆراوجۆرەکان لەخۆ دەگرێت.

لە نموونەی سێیەمیش، وشەی (دەنگخۆشەکە) وەکو ناوێکی لێکدراوی ناسراو و بکەری رستەکە هاتووە، وشەی (دەنگ)ی لێکراوەتەوە، کە ئەو هێما زمانیانەیە، هەر مرۆڤێك، یان مەخلوقێکی تر دەریدەبڕێت.

لە ئەدەبیاتی کوردی و لە قسەی ئاسایی خەڵکیش، گەلێ جار ئەو هونەرە قسەو دەربڕینەکان جوان و سەرنجڕاکێش و کاریگەر دەکات، ئاوازێکی خۆشیان بۆ دروست دەکات، لە شیعری کلاسیکیش گرنگی پێدراوە، لە خوارەوە چەند نموونەیەك لەو بارەیە دەخەینە بەرچاو:

ـ گوڵی باغی ئیرەمی بۆتانم

شەبچراغی شەبی کوردستانم... مەلای جزیری

وشەی (شەبچراغ) کەرتکراوەو وشەی (شەب)ی راستەوخۆ لە دوا هێنراوەتەوە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی دروست کردووە.

ـ شەوچرای شەوی کوردستانم ڕۆ

هیوای دوارۆژی نیشتمانم ڕۆ... دلزار

وشەی (شەوچرا) کەرتکراوەو وشەی (شەو)ی راستەوخۆ لە دوا هێنراوەتەوە، ئەوەش رەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی دروست کردووە.

ـ گەر حەقیقەت حەق بدا من یارێکی دڵدار دەوێ

ویش وەکو من سوختە جان و دڵ چوو کورەی نار دەوێ

دائیمەن دەر خەوف و دەهشەت دڵ لە ڕێی جەببار دەوێ

ڕاهیرەن ئەهلی بوت و ناقوس پەرست زوننار ئەوێ
باتینی عالەم بە (تەحتەل ئەرز) تا لەوح و قەڵەم... شێخ ئەحمەدی کۆر
وشەی (حەقیقەت) کەرتکراوەو وشەی (حەق)ی ڕاستەوخۆ لە دوا هێنراوەتەوە، ئەوەش ڕەگەزدۆزی ناتەواوی کەرتی دروست کردووە.

**هێنانەوە:**

هێنانەوە (التصدير)، یان (رد العجز عن الصدر).. بریتییە لە بوونی دوو وشەی هاوشێوە، یان هاوڕەگەز، یەکیان لە کۆتایی دێڕەکە دێت، ئەوی تریشیان دەکەوێتە سەرەتای نیوە دێڕی یەکەم، یان ناوەڕاستی، یان کۆتاییەکەی، یان سەرەتای نیوە دێڕی دووەم، یان ناوەڕاستەکەی.. بۆ نموونە:

ـ بەپیری ئەو مەهە چووم و بەسەر چووم
پەری بوو، ئەو نەبوو، شەوبوو، بەسەر چووم... مەحوی

لەم دێڕەدا شاعیر دووجار وشەی (بەسەر چووم)ی هێناوەتەوە، یەکیان لە کۆتایی نیوەی یەکەم و ئەوی دیکە لە کۆتایی دێڕەکە، ئەوەش هێنانەوەیەکی جوانە.

ـ عالەم خەریکی ڕوتبەو پارەیە
هەرتۆ بەتەنیا جەرگت پارەیە... بێکەس

لەم دێڕەدا شاعیر دووجار وشەی (پارە)ی هێناوەتەوە، یەکەمیان بە واتای ماڵ و سامان دێت، ئەو پارەو پولەیە، کە خەڵکی بە درێژایی ژیانی هەوڵی کۆکردنەوەی دەدات، بۆ دەستەبەرکردنی ژیانێکی خۆشتر، (پارە)ی دووەمیش بە واتای (پارچەپارچە)یی دێت، کە لە نیوە دێڕەکەی دووەمدا مەبەستیەتی پێی بڵێت هەر تۆ بە تەنیا لەبەر غەم و ناسۆری تر و گەورەتر جەرگت شەقارشەقارو، پارچەپارچەیە، ئەمە لە هەمانکاتدا ڕەگەزدۆزی تەواویشە.

ـ لە دنیا هەر کەسێ مەقصودی عیشقە
بکا وەك من بە کوللی تەرکی دنیا... حاجی قادری کۆیی

(دنیا) لە ناوەڕاستی نیوە دێڕی دووەم هاتووە و لە کۆتایی دێڕەکەش هێنراوەتەوە، هاوشێوەنە، بەڵام هاوواتا نینە، چونکە (دنیا)ی یەکەم شوێنی تیا ژیانە و (دنیا)ی دووەم واتە: خۆشییەکانی دنیا، ئەمەش هێنانەوەیەکی جوانە.

- ئەگەر خاڵت بڵێم میشکی خەتایە
عەزیزی من ئەمەم عەینی خەتایە... حاجی قادری کۆیی
(خەتا) لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم هاتووە و لە کۆتایی دێڕەکەش هێنراوەتەوە، هاوشێوەنە، بەڵام هاوواتا نینە. چونکە:
خەتای یەکەم: شارێکە لە وڵاتی چینی کۆن.. خەتای دووەم: واتە هەڵە و تاوان، بەوەش هێنانەوەیەکی جوان بەرجەستە بووە.

- تا داخڵی خەڵوەت دەبی ئەمجا بە وەکاڵەت
خاکی قەدەمی ماچ بکە بەم تەرزە کە تەرزە... حاجی قادری کۆیی
(تەرزە) لە ناوەڕاستی نیوە دێڕی دووەم هاتووە و لە کۆتایی دێڕەکەش هێنراوەتەوە، هاوشێوەنە، بەڵام هاوواتا نینە.. چونکە: تەرزەی یەکەم: واتە جۆر بەم تەرزە، واتە بەم جۆرە.. تەرزەی دووەم: واتە باش، کە تەرزە، واتە: کە باشە، ئەمەش هێنانەوەیەکی جوانە.

ئەم نموونانەی سەروو دیارە هەموویان هێنانەوەی (هاوشێوەیی) بوون، چونکە هەردوو ئەو وشانەی هاتوونە لە هەر دێڕێك لە شێوەدا وەکو یەك بوونە، بەڵام (هێنانەوەی هاوڕەگەزی)ش هەیە، کە شوێنی دوو وشەکانی هەر وەکو شوێنی ئەو دوو وشانەیە، کە لە هێنانەوەی (هاوشێوەیی) دەستنیشانمان کرد، بەڵام جیاوازییەکەی لەوەدایە، کە دوو وشەکانی ئێرە لە بنجدا یەك بنجیان هەیە، بەڵام لە شێوەدا وەکو یەك نین، بۆیە ناویان دەنێین (هێنانەوەی هاوڕەگەزی).. بۆ نموونە:

- دەبێ من سەرپەرشتی باخەکەم، کەم
لە کاروباری مەرجی باخەوانی... عەونی
لەم دێڕەدا لە نیوە دێڕی یەکەم و لە ناوەڕاستیدا وشەی (باخەکە) هاتووە، لە کۆتایی دێڕەکەش وشەی (باخەوانی) هاتووە، بەمەش (هێنانەوە) دروستبووە.. بەڵام دوو وشەکان هاوشێوە و تەنانەت هاوواتاش نین، ئەگەرچیش واتاکانیان بەیەکەوە پابەندە، وشەی یەکەم (باخەکە) ناوێکی ناسراوە، وشەی دووەمیش (باخەوانی) ناوێکی واتاییە و بە واتای کاری ئەو

بەسە دێت، کە لە باخدا ئیش دەکات، بەڵام سەرچاوەی دروستبوونی هەردوو وشـەکان وشـەی (باخ)ە، بۆیە ئەگەر بە واتاش لێکجیابن، بەڵام (هاوڕەگەز)ن و یەك بنجیان هەیە.

## کەرتکردن:

(کەرتکردن) لە عەرەبیدا (التشطیر)ی پێـدەگوترێت.. بریتییـە لـەو سـەروایەی، کـە بـە بێجگەی سەروای گشتی هۆنراوەکە، شاعیر بۆ تەفعیلـە و دەسـتەواژەکانی نێـو دێـڕ و نیـوە دێڕەکانی هۆنراوەکەی دادەنێت.. بۆ وێنە:

ـ ئیلاهی زۆر شوکر ڕۆژێکی چەند پیرۆز و مەحموودە

عەدالەت، ئەمنییەت، ڕاحەت، سەراسەر ئێستە مەوجودە... بێکەس

لە نیوە دێڕی دووەمدا، سێ وشەی عەدالەت، ئەمنییەت، ڕاحەت، بە دوای یەکدا هاتوون، کە پیتی کۆتاییان (ت)، جۆرە سەروایەکیان بۆ دروست دەکات و لە کاتی خوێندنەوەیان هەست بە جۆرە وەستانێك لە کۆتاییـان دەکـەیت، وەك ئـەوەی هـەر یەکـەیان کـەرتێکی سـەرواکراوی سەربەخۆ بێ، ئەمەش، چونکە لە شیعردایە بۆیە بە (کەرتکردن) دەناسرێت.

## جۆرەکانی (کەرتکردن):

بە شێوەیەکی گشتی دەکرێ لە دوو ڕوانگەوە جۆرەکانی (کەرتکردن) دەستنیشان بکەین:

یەکەم: بەپێی ئەو دابەشەکردنەی شاعیر بۆ دێڕەکەی دەکات، (کەرتکردن) ئەم جۆرانەی هەیە:

١ـ شاعیر دێڕەکەی دەکاتە چوار کەرتی یەکسان و هەردوو کەرتەی بـە شـێوەیەك سـەروادار دەکات، بۆ وێنە:

ـ حوسن و جەمالی جانان، نادێرتن تو پایان

هەرچی نەبن بیدایەت، ئەصلەن نەهن نیهایەت... مەلای جزیری

ئەم دێڕە کراوەتە چوار کەرتی یەکسان، دوو کەرت لە نیوە دێـڕی یەکـەم، بـە پـیتی (ن) سەروادار کراون، دوو کەرتیش لە نیوە دێڕی دووەم، بە پیتی (ت) سەروادار کراون.

٢ـ شاعیر دێڕەکەی دەکاتە چـوار کـەرتی یەکسـان، سـێ کـەرتی یەکـەمی بـە پیتێـك، سەروادار دەکات، هەرچی کەرتی چوارەمیشە سەروایەکەی لەگەڵ سەروای گشتی هۆنراوەکەی یەکدەخات، بۆ وێنە:

ـ لە بەرقی ڕەنگی شەڕوالّی، حەیا دامێنی هەلّمالّی
لە تەقەقەی دەنگی خڕخالّی، لە گەردوون زوهرە داماوە... حاجی قادری کۆیی
سێ کەرتی یەکەمی ئـەم دێـڕە بـەپیتی (لّ) سـەرواداركراون، دوا کـەرتیش سـەروای گشـتی هۆنراوەکەی پێ پارێزراوە.

ـ دەمێ نەفعەی نەسیمی خۆی، هەناسەی خۆش شەمیمی خۆی
لە ئەنعامی عەمیمی خۆی، بە عالـــەمدا پەرێشانە... چروستانی
سێ کەرتی یەکەمی ئەم دێڕە بەپیتی (م) سەرواداركراون، دوا کـەرتیش سـەروای گشـتی هۆنراوەکەی پێ پارێزراوە.
دووەم: بە پێی جۆری وشە و دەســتەواژە کـەرتکراوەکان، یـان سـەرواداركراوەکان، دەشـێ (کەرتکردن) ئەم جۆرانەی هەبێ:
١ـ کەرتکراوی هاوکێش: ئەو کەرتکراوەیە، کە شاعیر دێت دێڕەکەی بە هاوکێشی و یەکسانی بەسەر چەند کەرت و هەلّوێستەیەکی وەك یەك لە ژمارەی بڕگەکانیان دابەش دەکات و هەردوو نیوە دێڕەکانیش دەگرێتەوە نەك یەکێ لە نیوە دێڕەکان.. بۆ وێنە:
ـ من دی سەحەر، شاهێ مەجەر، لە بسێ دبەر، مەخموورىوو
ئەودیم زەری، سوور موشتەری، یارەب پەری، یاحور بوو
حوری وەشە، شیرین مەشە، کاکۆل ڕەشە، خالّ حەبەشە
خالّێن دقەر، مسکێن تەتەر، نازك بەشەر، کافوربوو
نازگ لەتیف، گەردن خەفیف، لەبسێ شەریف، کیخمە و قەدیف
من دی بەوەخت، ئەونیك بەخت، ئیرۆ لەتەخت، مەغفور بوو... مەلای جزیری
ئەم هۆنراوە بەرزەیە لە سەرەتا و تا بنەتا، هەمووی لەسەر یەك جۆر دەڕوا، هەر دێڕێکـی دابەشی هەشت هەلّوێست کراوە، هەر هەلّوێستی چوار بڕگەیە، بێجگـە لـە سـەروای گشـتی هەموو هۆنراوەکەش، هەموو کەرتەکانی هەرنیوە هۆنراوەیـەك سـەروایەکی سـەر بـە خۆیـان هەیە، لە ژمارەی بڕگە یەکسانن و لەسەر یەك کێشیش داڕێژراون.
ـ کەرتکراوی ناهاوکێش: ئەو کەرتکراوەیە، کـە شـاعیر تیایـدا دێڕەکـەی بەسـەر چـەند هەلّوێستە و دەستەواژەیەکدا کەرت دەکات، بێ ئەوەی ڕەچاوی هاوکێشی و یەکسانی ژمارەی بڕگەکانیان بکات.. بۆ وێنە:

ـ دیلانۆکێ، دیلانێ، هەوار دیلانێ

دیلانۆکێ، دیلانێ، هەوار دەرمانێ

ئەم دێڕە، هەر نیوە دێڕێکی بەسەر سێ هەڵوێست کەرتکراوە، یەکەمیان (٤) بڕگە، دووەمیان (٣) بڕگە، سێیەمیان (٥) بڕگەیە.. ئەمەش نایەکسانی و ناهاوکێشی کەرتەکانیان پیشان دەدات.

## گێڕانەوە:

لە عەرەبیدا (الترديد)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە بەکارهێنانی چەند جارەی وشەیەك، یان دەستەواژەیەك بەو مەرجەی هەرجارەی لە پاڵ شتێکەوە هاتبێت.. ئەمەش بە بەرچاوگرتنی ئەو وشەیەی (گێڕانەوە)کە دروست دەکات.. بۆ نموونە:

ـ تەریقەت بۆ شەریعەت بێ، چە نوربەخشی، چە حەلوانی

شەریعەت بۆ حەقیقەت بێ، چە ڕەببانی، چە عوسمانی... مەلا عوسمان

(چە) وشەی پرسە چوار جار لە پاڵ وشەکانی نوربەخشی، حەلوانی، ڕەببانی، عوسمانی گەڕێندراوەتەوە.

ـ گوڵێ بەیبون و گوڵێ موفەررەح

بۆنیان خۆشترە لە مسکی و قەدەح... پیرەمێرد

(گوڵ) ناوێکی سادەیە، لە نیوە دێڕی یەکەمدا دووجار لە پاڵ وشەکانی (بەیبون) و (موفەررەح) گێڕدراوەتەوە.

شایانی باسە گێڕانەوە چەند جۆرێکی هەیە، هەندێکیان بریتینە لەمانەی خوارەوە:

### ١ـ گێڕانەوەی ئامرازی پەیوەندی:

### أ ـ گێڕانەوەی ئامرازی پەیوەندی (بۆ):

ـ بۆ ڕووناکی، بۆ هیوای پیرۆزی گەل

وادەیە ئەمڕۆ، دەبا هەڵمەت بەرین... مەدحەت بێخەو

(بۆ) کە لە پاڵ وشەکانی (ڕووناکی) و (هیوای پیرۆز)دا دوو جار گەڕێنراوەتەوە (ئامرازی پەیوەندی)یە.

**ب ـ گێڕانەوەی ئامرازی پەیوەندی (بە):**

ـ بە باڵی خەیاڵ بە لاف و گەزاف

هەڵمان ئەفڕێنن بۆ سەر کێوی قاف... پیرەمێرد

(بە) ئامرازێکی پەیوەندییە، دوو جار لە پاڵ وشەکانی (باڵ) و (لاف) گێڕدراوەتەوە.

**٢ـ گێڕانەوەی ئامرازی نەفی: ئەوەش بە پێی جۆری ئامرازە نەفییەکان زیاتر لە شێوەیەکی هەیە، لەوانە:**

**اـ گێڕانەوەی ئامرازی نەفی (نە):**

ـ نە دەنگی دیار نە سەدای یار بوو

(لیس فی الدیار) غەیرە دیار بوو... پیرەمێرد

(نە) ئامرازێکی نەفییە، دوو جار لە پاڵ وشەکانی (دەنگ) و (سەدا) گێڕدراوەتەوە.

ـ زەنگین و مەزن ژینی لە مێرگێکی بەهارە

سرك و قەڵەو و تورە نە بەربارە نە غارە... چروستانی

(نە) ئامرازێکی نەفییە، دوو جار لە پاڵ وشەکانی (بەربارە) و (غارە) گێڕدراوەتەوە.

**ب ـ گێڕانەوەی ئامرازی نەفی (بێ):**

ـ خوای گەورە و بزورگ پادشای بێ نیاز

بێ هاوبەش بێ کەس بێ شوێن بێ هامراز... پیرەمێرد

(بێ) ئامرازی نەفییە، لە نیوە دێڕی دووەم چوار جار لە پاڵ وشەکانی: (هاوبەش) و (کەس) و (شوێن) و (هامراز) گێڕدراوەتەوە.

**٣ـ گێڕانەوەی ئامرازی لێکدەر:**

**أ ـ گێڕانەوەی ئەگەر**

ـ لە ژێر بەیداغی گەردووندا ئەگەر دونی و ئەگەر عالی

مەتاعی پڕ بەهات گاهێ ڕەخیصەو گەهگەهێ غالی... ئەسعەد مەحوی

(ئەگەر) ئامرازی لێکدەرە دوو جار لە پاڵ وشەکانی (دونی) و (عالی) گێڕدراوەتەوە.

**ب ـ گێڕانەوەی (یا، یا)**

ـ بەڵام محەمەد هەر بێ وچانە

یا لە ڕەنجبەری، یا لە کێوانە...ئەحمەدی موفتی زادە

(یا) ئامرازی لێکدەرە دوو جار لە پاڵ وشەکانی (ڕەنجبەری) و (کێوان) گێڕدراوەتەوە.

**٤ـ گێڕانەوەی ناو:**

ـ بەرچاو و پێڵاو هەردووکیان تەنگ بێ

ئەبێ پێی دڵ و پێی ڕۆیین لەنگ بێ... پیرەمێرد

(پێ) ناوێکی سادەیە، لە نیوە دێڕی دووەمدا دووجار لە پاڵ وشەکانی (دڵ) و (ڕۆیین) گێڕدراوەتەوە.

**٥ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناو: ئەوەش بە پێی جۆری ئاوەڵناوەکە زیاتر لە ژمارەیەکی هەیە، لەوانە:**

**أ ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناوی ژمارەیی:**

ـ بێ گورە و بڕە، بێ چرپە و بێ دەنگ

تێکرا لە کارن، یەك ڕەنگ، یەك ئاهەنگ... پیرەمێرد

(یەك) ئاوەڵناوی ژمارەییە، لە نیوە دێڕی دووەم دوو جار لە پاڵ وشەکانی: (ڕەنگ) و (ئاهەنگ) گێڕدراوەتەوە.

**ب ـ گێڕانەوەی ئاوڵناوی نیشانە:**

ئەم دڕك و داڵە و ئەم قەل و داڵە

مانەوە لە شوێن ئەو گەورەماڵە... پیرەمێرد

(ئەم...ە) ئاوەڵناوی نیشانەیە بۆ تاکی نزیك، لە نیوە دێڕی یەکەم جارێك بۆ وەسفی (دڕك و داڵ) و جارێك بۆ وەسفی (قەل و داڵ) گێڕدراوەتەوە.

**ج ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناوی پرس:**

ـ ڕۆڵە بزانە ترێ چەند ڕەنگە

کامیان زوو ڕەزەو کامیان ئاونگە... پیرەمێرد

(کام) ئاوەڵناوی پرسە دوو جار لە پاڵ وشەکانی (زوو ڕەز) و (ئاونگ) گێڕدراوەتەوە.

**د ـ گێڕانەوەی ئاوەڵناوی چۆنی:**

ـ چەندی زەڕب و تەرح و جەمعی بۆ دەکەم، هەر هیچ دەکا

دەستی هیچ و عەقڵی هیچ و لاقی و چاوی هیچ... بێبەش

لە نیوە دێڕی دووەمدا، وشەی سادەی (هیچ) وەك ئاوەڵناوێکی نادیاری سادە، چوار جار گێڕادراوەتەوە، جارێ پەسنی (دەست)، جارێ پەسنی (عەقڵ)، جارێ پەسنی (لاق)، جارێ پەسنی (چاو)ی پێدراوە.

**٦ـ گێڕانەوەی ئامرازی پەیوەندی و ئاوەڵناوی نیشانە:**

ـ های لەو خۆشییە و لەو لیقای خوایە

سەڵتەنەتێکی ئەو تۆی تێدایە... پیرەمێرد

(لەو...ە) پێکهاتووە لە (لە)ی ئامرازی پەیوەندی و (ئەو....ە)ی ئاوڵناوی نیشانە بۆ تاکی دوور، بەڵام (ئە) بە هاتنی (لە) لە پێشیدا ون بووە و ئەوەی ماوە (و)ەکەیەتی، بەم شێوەیە (لەو....ە) دروستبووە، دوو جار بۆ وەسفی وشەکانی (خۆشی) و (لیقای خوا) گێڕدراوەتەوە.

**٧ـ گێڕانەوەی ناوی لێکدراو:**

ـ خزمینە لە بۆ دەفعی شەڕی دوژمنی بەدخوو

بۆ مەحوی بناغە و ئەسەری دوژمنی بەدخوو

بۆ کوشتن و بۆ قەتعی سەری دوژمنی بەدخوو

بۆ گەردن و سینە و کەمەری دوژمنی بەدخوو

بادەست بە قەمە و خەنجەری پچڕانی وەتەن بێن..میهری

لەم پێنج خشتەکییەدا (دوژمنی بەدخوو) وەك (ناوێکی لێکدراو)یەك چوارجار بەدوای وشەکانی (شەڕ)و (ئەسەر)و (سەر)و (کەمەر)دا گێڕدراوەتەوە.

**٨- گێڕانەوەی رستە:**

ـ مەدحی ئیحسانی بکەم، عیلمی بکەم، عەدلی بکەم
بە خودا خاریجە ئەو صافی حەمیدەی لە ژمار.. شێخ رەزا

لە نیوە دێڕی یەکەمدا (بکەم) رستەیەکە، لە فرمانی رانەبردووی ئینشائی و (م)ی راناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاك پێکهاتووە، کە بکەرە و بۆ شاعیر دەگەڕێتەوە.. شاعیر ئەم رستەیەی سێ جار گێڕاوەتەوە، جارێك لەپاڵ (ئیحسان)، جارێك لە پاڵ (عیلم)، جارێك لەپاڵ (عەدل).

**گێڕانەوەی دروست و گێڕانەوەی دەستکاریکراو:**

١- گێڕانەوەی دروست: مەبەست لەمە ئەوەیە، کە وشە گێڕدراوەکە وەکو خۆی و بێ دەستکاری چەند جارێك لە پاڵ وشەی دیکە دەگێڕدرێتەوە.. بۆ نموونە:

ـ پڕ دەم و پڕ زمان و دڵیانە
هەموو بەم زیکرەیە فەرەحناکن... حەمدی

(پڕ) ئاوەڵناوی چۆنییە، دوو جار لە پاڵ وشەکانی (دەم) و (زمان) گێڕدراوەتەوە، چ دەستکاریشی نەکراوە.

٢- گێڕانەوەی دەستکاریکراو: مەبەست لەمە ئەوەیە، کە وشە گێڕدراوەکە لەبەر کێشی هۆنراوەکە شاعیر ناچاردەبێت، جارێك لە جارەکان دەستکاری وشەیێکیان بکات و کەم، یان زۆرتری بکات.. بۆ نموونە:

گاهێ دەبنە دوژمنی ئەتراك و گەه ئینگلیز
گاهێ لە عەرەب چاو ئەبڕن گەه لە عەجەم سەر... حەمدی

(گاهێ) چوار جار گێڕدراوەتەوە، لە پاڵ چوار وشان، دوو جار بە تەواوی و دوو جاری تر بە کورتبڕی، چونکە کێشی هۆنراوەکە ئەوەی چەسپاندووە.

گێڕانەوەی فرە: ئەو گێڕانەوەیە، کە لە تەنیا دێڕێکدا بە زیاتر لە شتێك گێڕانەوەکە ئەنجام دراوە.. بۆ نموونە:

ـ دەمێ بۆ گوڵ، دەمێ بۆ دڵ، زەلیل و زار و گریانم

گوڵەکەم ڕۆ، دڵەکەم ڕۆ، بە جاریٚ ماڵی ویٚرانم... ناری

(دەمیٚ بۆ) دوو جار لە پاڵ وشەکانی گوڵ و دڵ گیٚڕداوەتەوە، هەروەها (ڕۆ) دوو جار لە دوای وشەکانی گوڵەکەم و دڵەکەم گیٚڕداوەتەوە. بەمەش گیٚڕانەوەی فرە بەرهەمهاتووە.

## گەڕانەوە:

بریتییە لە گەڕانەوەی شاعیر لە سەرەتای دیٚڕی دووەمیدا، یان لە سەرەتای نیوە دیٚڕی دووەمیدا، بۆ جەختکردنەوە لەسەر واتای ئەو وشە، یان ئەو وشانەی، لە ناوەڕاست، یان کۆتایی دیٚڕی یەکەمیدا، یان نیوە دیٚڕی یەکەمیدا هیٚناونیەتی، مەبەستیش لەمە تۆخکردنەوەی ئەو وشەیەیە، کە دووبارە دەگەڕیٚتەوە سەری، جا ئەمەی لەبەر پیشاندانی دەسەڵاتی شیعری خۆی بیٚت، وەها بکات، یان لەبەر جوانییەك کە بە هۆیەوەی چیٚژیٚکی ئەدەبی خۆشتر بۆ شیعرەکەی دروست دەکات، یان بۆ روونکردنەوەی هۆی ئەو بارەی بیٚ، کە گوزارشتی لیٚ کردووە، یان لەبەر هەر پیٚویستی و جوانکارییەکی تر، کە شاعیر بە پیٚویستی دەزانیٚت.

شیاوی باسە: (گەڕانەوە) نە نووسەرانی کورد و نە نووسەرانی عەرەبیش ئاماژەیان بۆ نەکردووە، بەڵام وەکو حاڵەتیٚك لە شیعری کوردیدا، بە لای من گرنگ و جوانەو شایانی ئاماژە بۆکردنە، چونکە ئەمەش شیٚوازیٚکی تایبەتە و لادانە لە باری ئاسایی ئاخاوتن.. بۆیە من وەهای ناودەنیٚم و دەیخەمە خانەی (جوانکاری وشەیی).. بۆ نموونە:

ـ زۆر دەپاڕاوە لە وەقتی صەفوەتی

تاکو خوا ئەزیەت نەداتن ئوممەتی

ئوممەتی ڕاست بن بکەن شەرم و حەیا

خواپەرست بن تەرك بکەن ڕیٚگەی ڕییا... ڕەشاد موفتی

ئوممەت لە کۆتایی دیٚڕی یەکەم هاتووە، شاعیر لە سەرەتای دیٚڕی دووەم گەڕاوەتەوە سەری و تۆخیکردۆتەوە.

ـ بولبول لە باغی جەننەتیٚ، دایم دەخویٚنیٚ، عەندەلیب

صەد ئافەرین لەو صوحبەتەی شادبین بە یاری عەن قەریب

شادبین بە یاری نەو نەمام، بەو دڵبەری شیرین کەلام

شاە و سەڵاتین بۆی غولام، باڵا نەمامی دل فریب... شیٚخ ئەحمەدی کۆر

لە ناوەڕاستی نیوە دێڕی دووەمی دێڕی یەکەمدا شاعیر دەستەواژەی (شادبین بـە یـاری)ی هێناوە، لە سەرەتای نیوە دێڕی یەکەمی دێڕی دووەمیش گەڕاوەتەوە سەر هەمان دەستەواژەی (شادبین بە یاری) و درێژەی پێداوە، کە بەچی شادبین.



**جۆرەکانی گەڕانەوە:**

گەڕانەوە یان لە سنووری تاکە دێڕ دەکرێت، یان لە سنووری دوو دێڕ، یانیش لە کۆپلەیەك، یان لە چەند دێڕێکی کۆپلەیەکی شیعری نوێ، یانیش لە تەواوی هۆنراوەیەکدا.. بۆ نموونە:

**١ـ لە سنووری تاکە دێڕدا:**

ـ گۆتییان ئەی فەخری عالەم مەرحەبا

مەرحەبا نازداری ئادەم مەرحەبا... رەشاد موفتی

مەرحەبا لە کۆتایی دێڕی یەکەم هاتووە، شـاعیر لـە سـەرەتای دێـڕی دووەم گەڕاوەتـەوە سەری و تۆخیکردۆتەوە.

- پانزە ڕۆژێکە خەریکی کارم

کار وەکو خۆیە و بار نابێ بارم

لەم دێڕەدا لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم، شاعیر وشەی (کار)ی هێنـاوە، کـە گوایـە پـانزە ڕۆژێکە خەریکیەتی، لە پاشان لە سەرەتای نیوە دێـڕی دووەمـی، دیسـانەوە هاتۆتـەوە سـەر وشەی (کار)ەکە، روونی کردۆتەوە، کە بە کوێ گەیشتووە.

**٢- لە دوو دێڕدا.. وەکو لە پارچەك:**

- خوا عێوەزی کرد ئەو هەواو بانە

نیشانەی پاییز زەردی خەزانە

خەزانی داوە درەخت خوەرەتاو

بێ شك پاییزە چیگۆ بووە ئاو... کاکە حەمە عەلی رەحیم پوور

خەزان لە کۆتایی دێڕی یەکەم هاتووە، شاعیر لە سەرەتای دێڕی دووەم گەڕاوەتەوە سەری و تۆخیکردۆتەوە.

١- لەم هۆنراوەدا..وەکو ئاماژەمان بۆی کرد، دەشێت لە تەواوی هۆنراوەشدا لە هەموو دێڕەکانی دەربکەوێت، لە ئەدەبی کوردیدا (ئەحمەدی کۆر) یەکێکە لەو شاعیرە گرنگانەی، کە ئەم هونەرەی لە زۆربەی شیعرەکانیدا بەرجەستە کردووە، بۆ نمونە ئەم شیعرەی دەخەینە بەر چاو:

ـ ئەی غەزالان شۆخ و شەنگان و خەدەنگان ڕاست و چەپ
دڵ چوو سەنگان خوو پڵنگان دای لە قەلبم ڕاست و چەپ
دای لە قەلبی من حەزینە چەند خەدەنگی سەر بە خوێنە
ئەو لە من کردن برینە خوێن بە خوڕ دێ ڕاست و چەپ
خوێن لە من دێ بێ قەرارە هەڵقوڵانی چەشمە سارە
ڕووبنیشن هەر چەپارە بۆم بگرێین ڕاست و چەپ

لەم سێ دێڕانەی سەروو، لە دێڕی یەکەمدا دەستەواژەی (دای لە قەلبم)ی هێناوە، سەرەتای دێڕی دووەمی بۆ درێژکردنەوە (دای لە قەلبم) تەرخانکردۆتەوەو دێڕەکەی بۆ ئەو باسە تەرخانکردووە، واتە لە سەرەتای دێڕی دووەم گەڕاوەتەوە سەر ئەو دەستەواژەی (دای لە قەلبم)، کە لە دێڕی یەکەم ئاماژەی بۆ کردبوو.

لە کۆتایی دێڕی دووەمیش وشەی (خوێن)ی هێناوە، لە دێڕی سێیەمدا گەڕاوەتەوە سەر (خوێن)ەکەو درێژی کردۆتەوە.. بەم شێوەیە، ئەگەر هەموو ئەو هۆنراوەیەی تەماشا بکەین، هەمان ڕاستیمان بۆ دەردەکەوێت، بۆ نموونە لە دێڕی سێیەمی ڕستەی (بۆم بگریێن)ی هێناوە، لە سەرەتای ئەو دێڕە چوارەی، کە ئێستا دەیخوێنینەوە، دەبینین گەڕاوەتەوە سەر (بۆم بگرییێن):

ـ بۆم بگرییێن زۆر بەجۆشە پێم نەما هیچ عەقڵ و هۆشە
ماری ڕەش یەکسەر خرۆشە عەقرەبان گرت ڕاست و چەپ
مار و عەقرەب کرد هجومە وەی لە خۆم بەدبەخت و شوومە
هیندەیان شیر لێ دەسوومە دێنە جەنگم ڕاست و چەپ
دێنە جەنگم چەند هەزاران هیندیی و ڕۆم و تەتاران
قەوسییان تیر لێ دەباران جووت بە جووت دێن ڕاست و چەپ
وا بە شدەت دێنە خوارێ دەستی من دامانی یاری
خوێن لە چاوانم دەباری جو بە جو دێن ڕاست و چەپ

جو بو جو سەر گرد لە دامان فرقەتی بێ حەد و سامان
ئەز دەناڵم سوبح و شامان سینە داغم ڕاست و چەپ
سینە داغم دەردەناکم من لە دوو لوتفت هیلاکم
ڕوح و گیانی خۆم فیداکەم ژێری نەعلت ڕاست و چەپ
ژێری نەعلت کەحلی چاوم کورەیی پڕ جۆش و تاوم
شبهی پەروانە سووتاوم دێمە گەردش ڕاست و چەپ
دێمە گەردش میسلی بادە دل لە بونی نامورادە
ئاخ لە دەست جووتێك جەلادە تیغ بە خێن دێن ڕاست و چەپ
تیغ بە دەستن مەی فرۆشن بۆ هیلاکی جان بە جۆشن
عاشقانت خوێن دەنۆشن جورعە جورعە ڕاست و چەپ
سووت دەروونم وەك زوخالّی کەوتمە بەحری ئاه و نالّی
ناپرسی جارێك لە حالّی کوشتەکانت ڕاست و چەپ
(ئەحمەدی کۆر)ی حەزینە دلّ لەسەر صیدق و یەقینە
یاری خۆت حازر ببینە دوور و نێزیك ڕاست و چەپ... ئەحمەدی کۆر

**پاتکردنەوە:**

(پاتکردنەوە) لە عەرەبیدا (التکرار)ی پێدەڵێن، بریتییە لەوەی شاعیر وشەیەك، یان دەستەواژەیەك، یان ڕستەیەك بێنێ، چەند جارێك پاتی بکاتەوە، بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی، بەومەرجەی هەموویان واتایان یەك بێت و لە جارێکەوە بۆ جارێکی تر واتایان نەگۆڕێت. بە واتە: نابێت وشە و دەربڕینەکان نە لە ڕوالّەت و نە لە گوزارەدا، هیچ گۆڕانیان بەسەر دابێت.. بۆ وێنە:

ـ ماینە کوێت جاران، کە دەتگوت ڕەوتی ڕەوتی ئاهووە
ئێستا هەستانی لەسەر ئاخوڕ بەیاهوو یاهووە.. شێخ ڕەزا

لەنیوە دێڕی یەکەمدا (ڕەوتی ڕەوتی)و، لە نیوەی دێڕی دووەمدا (یاهوو یاهوو) (پاتکردنەوە)ن، چونکە لە پاتکردنەوەی یەك وشە پێك هاتوون.. واتایان یەکەو، بە دوای یەکیشدا ڕیز کراون.

## جۆرەکانی (پاتکردنەوە):

یەکەم: بە بەرچاوگرتنی مەبەست لە پاتکردنەوە:

شاعیر کاتێك وشەو دەستەواژەیەك زیاتر لە جارێك بەدوای یەکدا پاتدەکاتەوە، بێگومان مەبەستێك بۆ ئەمەی پاڵدەنێت، جا بە بەرچاوگرتنی ئەو مەبەستانە، دەکرێت ئەو جۆرانەی پاتکردنەوە دەستنیشان بکەین:

**١- پاتکردنەوە بە مەبەستی تەحەداو بەرەنگاری کردنەوە، بۆ وێنە:**

ـ تابمێنێ نوری چاوو، هێزی پێم

دێم و دێم و دێم و دێم و دێم.. هێمن

لە نیوە دێڕی دووەمدا، شاعیر شەش جار (دێم)ی پاتکردۆتەوە، بەمەبەستی تەحەدای دوژمنانی.

**٢- پاتکردنەوە بە مەبەستی پێداگرتن و تەوکیدکردن، بۆ وێنە:**

ـ لەملی بکەین تەوقی زیو و زەڕ

هەتا قیامەت هەر کەرەو، هەر کەر.. عەلی کەمال باپیر ئاغا

وشەی (هەر کەر) لە نیوە دێڕی دووەمدا دووجار پاتکراوەتەوە، ئەمەش بەو مەبەستەی کە (کەر) هەر کەرەو هەر چییەکی بۆ بکەیت، لەوە زیاتر بە شتێکی تر نابێت، وەك چۆن پەندێکی کوردیش لەو بارەوە دەڵێت: (کەر بچێتە بەغدایێ، نابێتە هێستر) بە هەمان مەبەست بۆ تەوکیدکردن و دڵنیایی کردنی بەرامبەر، شاعیر (هەرکەرەو، هەرکەر)ی بە پاتکراوەیی هێناوەتەوە.

**٣- پاتکردنەوە بە مەبەستی رێککردنی سەروای هۆنراوەکە، بۆ وێنە:**

ـ تێکدەرین، تێکۆشەرین

ئازادنیە، هەڵمەت بەرین

بۆ قەڵای سەرمایەدار

تێکدەرین تێکدەرین... دلزار

لە دوا نیوە دێڕی ئەم چوارینە وشەی (تێکدەرین) دووجار پاتکراوەتەوە، ئەمەش لەبەر رێکبوونی سەروای دوا نیوە دێڕەکە، لەگەڵ سەروای گشتی چوارینەکە، ئەگەرچیش لەلایەکی تریشەوە دەبینین لە هەمانکاتدا بۆ مەبەستی تەحەداو سووریەتی لەسەر داواکەش دێت.

دووەم: بە بەرچاوگرتنی ژمارەی وشە پاتکراوەکە ئەم جۆرانەی پاتکردنەوە هەیە:

١ـ پاتکردنەوەی دوویی.. ئەو پاتکردنەوەیە، کە وشە پاتکراوەکە دوو جار بە دوای یەکدا دێت، کە لە راستیدا ئەمە بچووکترین سنووری پاتکردنەوەیەو لەوە کەمتر، پاتکردنەوەکە لە نێو دەچێ.. دەرکەوتنی ئەوەش لە سنووری تاکە دێڕدا دەشێ چەند شێوەییێکی هەبێ.. بۆ نموونە:

یەك: یەك پاتکردنە: ئەو پاتکردنەوەیە، کە یەك جار لە سنووری دێڕەکەدا هاتووە.. بۆ نموونە ئەوەی لە سەروو نووسیمان:

ـ ئەم قیسەیەی کە کردم، ناگاتە چەند ساڵی تر

ئەم حاڵەتە دەبینن، یەك یەك بە چاوی خۆتان... حاجی قادری کۆیی

لەم دێڕە (یەك یەك) یەك پاتکردنەوەی بەرهەمهێناوە.

دوو: دوو پاتکردنەوە: ئەو پاتکردنەوەیە، کە دوو جار لە سنووری دێڕەکەدا هاتووە.. بۆ نموونە:

ئەو زەمانە گەرمەیی بازاڕی نەگبەتیانە قەوم

حەمدی، وەك قەوم ڕابوەستێ فیرقە فیرقە هۆز هۆز... حەمدی

لە نیوە دێڕی دووەم وشەی (فیرقە) بە واتای (تیپ) دوو جار بە هاوشێوە و هاوواتا پاتکراوەتەوە، هەر لە نیوە دێڕی دووەم و لە دوای ئەو پاتکردنەوەی پێشوویش وشەی (هۆز) وەکو ناوێك دوو جار بە هاوشێوە و هاوواتا پاتکراوەتەوە.

سێ: سێ پاتکردنەوە: ئەو پاتکردنەوەیە، کە سێ جار لە سنووری دێڕەکەدا هاتووە.. بۆ نموونە:

نەنۆشێ ئاوی گوڵ بولبول منیش نەینێمە سەر دەم دەم

دەبێ ئەو شیوەنی گوڵ گوڵ بکا، من گریەیی دەم دەم... حەمدی

لە نیوە دێڕی یەکەم وشەی (دەم) بە واتای (دەمی شت پێخواردن) دوو جار بە هاوشێوە و هاوواتا پاتکراوەتەوە، هەر لە نیوە دێڕی دووەمیش وشەی (گوڵ) وەکو ناوێك دوو جار بە هاوشێوە و هاوواتا پاتکراوەتەوە، هەر لە نیوە دێڕی دووەمیش وشەی (دەم) بە واتای (ماوە) دوو جار بە هاوشێوە و هاوواتا پاتکراوەتەوە.

٣ـ پاتکردنەوەی سێیی.. ئەو پاتکردنەوەیە، کە وشە پاتکراوەکە سێ جار بە دوای یەکدا دێت، کە لە راستیدا ئەمە سنوورێکی فراوانتری پاتکردنەوەیەو لەوە کەمتر، پاتکردنەوەی دووییە.. دەرکەوتنی ئەوەش لە سنووری تاکە دێڕدا دەشێ چەند شێوەییێکی هەبێ.. بۆ نموونە:

ـ ئۆف ئۆف ئۆف

پایز ڕەنگی ماتەمە

دنیا تاریك و تەمە

نوری چاوانم کەمە... پیرەمێرد

(ئۆف) وشەی حەسرەتکێشانە، لە لەتە دێڕی یەکەم سێ جار پاتکراوەتەوە.

سێیەم: بە بەرچاوگرتنی جۆری ڕێزمانی وشە پاتکراوەکە ئەم جۆرانەی پاتکردنەوە هەیە:

١ـ پاتکردنەوەی ناو: لێرەدا پاتکراوە (ناو)ە.. بۆ نموونە:

ـ دڵ تەقەی تێکەوت بە جاری بوون بە نووکی نێزەوە

چاوی هەڵهێنا کە تەحریکی موژەی کرد فەوج فەوج... حەمدی

(فەوج) کە لە دوابەشی نیوە دێڕی دووەم دوو جار پاتکراوەتەوە، (ناو)ە.

٢ـ پاتکردنەوەی ڕستە: لێرەدا پاتکراوە (ڕستە)یە.. بۆ نموونە:

ـ بە غەیرەز باسی ئەوزارە، موهیممە دەرکی ئەوزارە

ئەوی بیستوومە بیستوومە، ئەوی دیتوومە دامناوە... حاجی قادری کۆیی

(بیستوومە) لە نیوە دێڕی دووەمدا دووجار پاتکراوەتەوە، ڕستەیەکە هاوشێوە و هاوواتایشە.

ـ دڵ بە پەرۆشە، دڵ بە پەرۆشە

خەبەرێکم بیست دڵ بە پەرۆشە... پیرەمێرد

(دڵ بە پەرۆشە) ڕستەیەکە دوو جار لە نیوە دێڕی یەکەم پاتکراوەتەوە.

ـ لەژێر سەقفێکا کۆڵەکەی نییە

کە ڕووخا ڕووخا ڕووگیری چییە؟... پیرەمێرد

رووخا ڕستەیەکی سادەیە، پێکهاتووە لە (ڕووخا)ی فرمانی رابردووی تێپەڕ و بکەرێکی ئەقڵی کە بۆ کەسی سێیەمی تاك دەگەڕێتەوە، ئەم ڕستەیە لە نیوە دێڕی دووەمدا دوو جار پاتکراوەتەوە.

٣- پاتکردنەوەی ئاوەڵناو: لێرەدا پاتکراوە (ئاوەڵناو)ە.. بۆ نموونە:

ـ وەرە ئەی دڵ بەسییە، بیدە سەگانی دەری یار

دڵەکەی کون کونی من، یا جگەری لەت لەتی خۆت... حاجی قادری کۆیی

(کون) لە نیوە دێڕی دووەم وەکو ئاوەڵناوێك، کە وەسفی دڵ دەکات دوو جار پاتکراوەتەوە، هاوشێوە و هاوواتایشە.. (لەت)یش هەر لە نیوە دێڕی دووەم وەکو ئاوەڵناوێك، کە وەسفی جگەر دەکات دوو جار پاتکراوەتەوە، هاوشێوە و هاوواتایشە.

**٤- پاتکردنەوەی ئاوەڵفرمان: لێرەدا پاتکراوە (ئاوەڵفرمان)ە.. بۆ نموونە:**

ـ دیسا نەسیمی بەهار نەرم نەرم هاتە خوار

دونیای زیندوو کردەوە، بە ئەمری پەروەردگار... وەفایی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا وشەی (نەرم) وەکو ئاوەڵفرمانێکی چۆنی، کە وەسفی فرمانی (هاتە خوار) دەکات، دوو جار پاتکراوەتەوە.

ـ عەینی فەیزە گەر دڵت لەت لەت بکا ئەهلی شەرەف

سەیری شەئنی شانە کە کردی بە ئەگریجە تەماس... حەمدی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا وشەی (لەت) وەکو ئاوەڵفرمانێکی چۆنی، کە وەسفی فرمانی (بکا) دەکات، دوو جار پاتکراوەتەوە.

**٥- پاتکردنەوەی راناو: لێرەدا پاتکراوە (راناو)ە.. بۆ نموونە:**

ـ ئیتر لە ڕاست و چەپەوە

هاواریان کرد هەوە هەوە... هێدی

وشەی (هەوە) راناوە، لە نیوە دێڕی دووەمدا دووجار بە هەمان واتا بەدوای یەکدا پاتکراوەتەوە، ئەوەش (پاتکردنەوە)ی دروست کردووە.

**٦- پاتکردنەوەی وشەی نەفی: لێرەدا پاتکراوە (وشەیەکی نەفی)یە.. بۆ نموونە:**

ـ کە میوان هات سەری ئەبڕین گۆشتەکەی

نەو، نەو، تخوا بابە ئەوە قەت نەکەی... پیرەمێرد

(نەو) وشەی نەفییە، لە نیوە دێڕی دووەمدا دوو جار پاتکراوەتەوە.

**٧- پاتكردنەوەی دەستەواژە، گرێ: لێرەدا پاتكراوە (دەستەواژە، یان گرێ)یێكە.. بۆ نموونە:**

ـ هەوای هاوینە، هەوای هاوینە

ئەمساڵ هاوینمان زۆر لێ بەقینە... پیرەمێرد

(هەوای هاوینە) گرێیەكی ناوییە دوو جار لە نیوە دێڕی یەكەم پاتكراوەتەوە.

**٨- پاتكردنەوەی وشەی داد و شەكوا: لێرەدا پاتكراوە (وشەیەكە بۆ دادپرسی و شەكوا)یە.. بۆ نموونە:**

ـ ئای ئامان ئامان سووتام، خۆشە وەك نوقڵی بادام

ڕەگی ڕۆحیان دەركێشام، لیرەكانیان دەرهێنام... پیرەمێرد

(ئامان) وشەی دەربڕینی داد و شەكوای حاڵە، دوو جار لە نیوە دێڕی یەكەم پاتكراوەتەوە.

### جیاوازی نێوان (گێڕانەوە) و (پاتكردنەوە):

(گێڕانەوە) و (پاتكردنەوە) وەك دوو هونەری جوانكاری وشەیی، ئەگەرچی هەردووكیان بریتی بن لە دووبارە و سێ بارەكردنەوەی وشە، یان گرێ و رستەو دەربڕینەكان، بەڵام ئەم جیاوازیانەشیان هەیە:

ئەو وشەیەی لە (گێڕانەوە)دا چەند جارێك دووبارە دەكرێتەوە، هەر جارەی دەبێت خرابێتە پاڵ وشەیەك، بەڵام ئەو وشەی لە (پاتكردنەوە) دووبارە دەكرێتەوە، ئەگەر هەر چەندجاریش پاتكرابێتەوە، هەر دەبێ لە تەك یەك بێن و نابێت وشەیەك، یان رستە و دەستەواژەیەك جیاوازی بخاتە نێوانیان، بۆ وێنە:

ـ لە شەش كەسبا، لەگەڵ شەش كەس شەریكی

چ ئەقڵێكە لەسەر كام فاك و فیكی... موفتی پێنجوێنی

لەم دێڕەدا، ئەگەر چی لە نیوە دێڕی یەكەمدا (شەش) دووبارە كراوەتەوە، بەڵام نێوانیان هەیە، جارێك خراوەتە پێش (كەسب) و جاری دووەم خراوەتە پێش (كەس).. بۆیە بەم جۆرە دووبارەكردنەوەیە دەڵێن (گێڕانەوە)، واتە دوای ئەوەی وشەیەك سەرەتا بەكار هاتبوو، ئێستا دووبارە پێویستی لە شوێنێكی ترو لە پاڵ وشەیەكی تردا دووبارەی كردۆتەوە.. بەڵام لە نموونەیەكی وەك ئەمەی خوارەوە:

ـ دوایی گەروی لێبگرەوە

دیلی بگرە ڕەوە ڕەوە... هێدی
وشەی (ڕەوە) لە نیوە دێڕی دووەمدا پاتکراوەتەوە، هیچ یەکەیان نە خراونەتە پاڵ وشەیەك ئەمەش (پاتکردنەوە)یە.

**بوونی پێویستە:**

لە عەرەبیدا (لزوم ما یلزم)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە وەکیەکی و هاوشێوە هاتنی پیتێك، یان چەند پیتێکی بەر لەو پیتەی، کە لە هۆنراوەدا رووی (سەروا) و لە پەخشاندا (سەروادار) دروست دەکات، ئەمەش (سەروا) و (سەروادار)ەکان جوان و رێکتر دەکات لە شێوە، بۆ سەر زار خۆشتر گۆ دەکرێن، بەر لە گەیشتنمان بە کۆتایی رستە، یان دێڕە شیعرییەکە، دەزانین کۆتاییان بە چی دێت.. بۆ نموونە:

ـ باسی باوکی مەکە ئارامی نییە ئەو تەرەسە
ڕۆژێ جاسووسە بە شەو تا بە سبەینێ عەسەسە
ناکرێ مەتح و سەنای تۆ بە زوبان و بە قەڵەم
حەقە مەتحت نەکەم و قافیە زانیم عەبەسە
شێر وەکو موورە لە لای زولفی کەمەند ئەندازی
فیلە مێشوولەیە لێی لابدە عەنقاش مەگەسە... حاجی قادری کۆیی

وشەکانی (عەسەسە) و (عەبەسە) و (مەگەسە) رەوی (سەروا)یان دروست کردووە، (س) پیتی رەوییە، (ە)ی بزوێنی پێش رەوی بوونی پێویستەیە.

چەند شێوەییێکی بوونی پێویستە

دیارە ئەو پیتانەی بوونی پێویستە دروست دەکەن، چەندی زۆرتربن، سەرواکە بەهێزتر و جوانتر دەکەن، بەڵام هەمیشەش ناکرێ پێش سەروا، یان پیتەکانی بوونی پێویستە هەر زیاتر لە یەك بن، بەڵکو جاری وەها هەیە یەك پیتە و جاری وا هەیە دوو پیتە و جاری وا هەیە سێ پیتە و دەشێ جاری وەها هەبێ زیاتریش بێت، لە خوارەوە تیشك دەخەینە سەر هەندێ لەمانە:

**١- بوونی پێویستەی یەك پیتی.. بۆ نموونە:**

ـ وەنەوشە شین پۆش مل کەچ نگون سار
سوسەن کون کون بێ، بە نینۆکی خار

دەنگی کەو ببڕێت لە دەوری کۆسار
سروەی با نەبێ لەسەر پەلکی دار
ئەستێرەی سیوەیل وێنەی تازێدار
ڕەشپۆش بێ شەوقی نەبینێ دیار...

لەم دێڕانە هەر سێ دێڕەکانی بە وشەکانی (خار) و (دار) و (دیار) کۆتایی هاتوون، پیتی (ڕ)ی کۆتایی وشەکانی ڕەوی دروست کردووە، پیتی (ا)ی بزوێنی پێش ڕەوییەکەش بوونی پێویستەیە.

ـ بە سووکی تێمەگە ئەم خاکە لاتان زۆر بەقیمەت بێ
هەمووی هەر خاکی دەست و پێ و، چاو و لێو و زارێکە
ئەگەر تۆ هەڵکەنی، سا ناودڵی خاك بۆت بەدەربێخی
چ جێگای ئاوەدانی بێ، چ جێگای شوێنەوارێکە
ئەگەربێت و بەچاوی دڵ سەرنج بگری، دەزانی تۆ
کە شار وێران بووە، وێرانەیە ئێستاکە شارێکە.. عەونی

لەو پارچەیەدا پیتی (ڕ)ی وشەکانی (لێو و زار) و (شوێنەوار) و (شار) ڕەوی دروست کردووە، پیتەکانی (ێکە) کە لە دوای پیتی (ڕ) هاتوونە، پاش ڕەوی نەە، پیتی (ا) کە لە پێش پیتی (ڕ)ەکە هاتووە پێش ڕەوییە و بوونی پێویستەیە.

**٢- بوونی پێویستەی دوو پیتی.. بۆ نموونە:**

گوڵ غەرقی ئاو و ڕەنگە
غونچە دەم و دڵ تەنگە
نێرگز گێژ و دەبەنگە
بولبول لەسەر ئاهەنگە
ڕۆژێکی شۆخ و شەنگە
لوتفێ بکە درەنگە... حەمدی

وشەکانی (تەنگە) و (ئاهەنگە) و (درەنگە) سەروایان دروست کردووە، (گ) پیتی ڕەوییە و سەرواکەی بەرهەمهێناوە، (ە)ی دوای ئەم ڕەوییە، پاش ڕەوییە، دوو پیتەکانی (ە)و (ن)ی پێش ئەو ڕەوییە (بوونی پێویستە)نە.

**٦- بوونی پێویستەی سێ پیتی.. بۆ نموونە:**

ئەی شەهیدان ئابڕۆی ئەهلی مەحەببەت با نەچێ
لەم مەسافی عەشقەدا بمرن بسووتێن بێ تەلاش
وا بەسەر تەختی هەواوە وەك سولەیمان عاشقت
تاجدارە هەرکەسێ سووتا وەکو پووش و پەلاش
ئەی سەنەم ئاوێنەیی ڕوومەت نیشانی خۆر مەدە
نەك بە جارێ گڕ لە گەردوون بەربدا عەکسی جەلاش... حەمدی

وشەکانی (تەلاش) و (پەلاش) و (جەلاش) سەروایان دروست کردووە، (ش) پیتی ڕەوییە و سەرواکەی بەرهەمهێناوە، سێ پیتەکانی (ە) و (ل) و (ا)یش کە لە پێشی ئەو ڕەوییە هاتوونە (بوونی پێویستە)نە.

**لێیوەرگرتن:**

لە عەرەبیدا (اقتباس)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی پەخشان یان شیعر شتێك لە قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، یان هەر گوتە و دەربڕینێکی بەهێز لە خۆ بگرێت، بەڵام مەرج لێرەدا ئەوەیە، کە وەرگیراوەکە، نابێت لە ڕستەیەکی سادە کەمتر بێت و نابێ ئاماژەش هەبێ، کە ئەو گوتەیە وەرگیراوە.. بۆ نموونە:

ـ کافر نەوینۆ سزای دەرد و خەم
سوپای خەم ئامان من کەردەن ماتەم... عەزیز

نیوە دێڕی یەکەم (کافر نەوینۆ سزای دەرد و خەم) گوتەی ئامادەی سەرزاری خەڵکییە، شاعیر وەریگرتووە و شیعرەکەی خۆی پێ دەوڵەمەند کردووە، چ ئاماژەشی نەکردووە، کە ئەم ڕستەیەی وەرگرتووە.

شایانی باسە ئەم (لێیوەرگرتن)ەش جۆری زۆرە، لە خوارەوە تیشك دەخەینە سەر هەندێکیان.

## جۆرەکانی لێیوەرگرتن:

١ـ لێیوەرگرتن لە قورئانی پیرۆز: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر بەشێك لە قورئانی پیرۆز، کە لە رستەیەکی تەواوی ئایەتێك کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات..

بۆ نموونە:

ـ ﴿سبحان الذي اسرى﴾ سەراتە

﴿قاب قوسين﴾یش ئەدنا جێگاتە... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی یەکەمدا ﴿سُبْحَانَ ٱلَّذِى أَسْرَىٰ﴾ ئایەتی ژمارە (١) سورەتی پیرۆزی ﴿الأسراء﴾ە، شاعیر وەریگرتووە و خستویەتییە ناو دێڕەکەی خۆی.

جاری وەهاش هەیە سورەتێکی پیرۆز بە تەواوی وەردەگیرێ و تێکەڵاوی شیعرەکە دەکرێت، بەڵام ناشگوترێ ئەمە سورەتە، بۆ نموونە:

ـ شێخ و دەروێش و مەلا کەوتووینە گێژاوی بەڵا

(قل هو الله احد) بگرە دەستم لەم زەحمەتە

وا بە (الله الصمد) پەنها ئەبەم یا (لم يلد)

هەم (ولم يولد) خووا ئەم کاتە کاتی رەحمەتە

یەعنی یا (من لم يكن له كفوا احد)

لوتف و رەحمم پێ بکە ئەم رۆژە رۆژی هیممەتە... ئەسعەد مەحوی

لێرەدا شاعیر هەموو سورەتی پیرۆزی (الأخلاص)ی وەرگرتووەو بە شیعرەکەی خۆی تێکەڵکردووە، چ ئاماژەشی بۆ نەکردووە.

٢ـ لێیوەرگرتنی بە فەرموودە: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر بەشێك لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ (اطلبوا العلم ولو بالصين) گەر تێبگەی تەمام

قەتعییەن تەحصیلی عیلم و مەعریفەت ناکەی حەرام.. بێکەس

(اطلبوا العلم ولو بالصين) یەکێکە لە فەرموودە بە نرخەکانی پێغەمبەری ئیسلام (درود و سڵاوی خوای لێ بێ)، شاعیر وەك و خۆی وەریگرتووە و مەبەستی هۆنراوەکەی خۆی پێ بەهێز کردووە.

٣ـ لێیوەرگرتن لە چەمکێکی ئایینی: لێرەدا قسەکەر، یـان شـاعیر بەشـێك لـە چـەمکێکی ئایینی، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکـات.. بۆ نموونە:

ـ شەوێ پیاوێك لە بەفرا ما، نەمرد ئاگرێکی دووری دی

لەلای من نائومێدی کفرە، ئەم ئاگرەی دڵم بو کێ... پیرەمێرد

(نائومێدی کفرە) وتەی زانایانی موسڵمانە، چەمکێکی شەرعییە، کە لە سەرچاوە فیکری و فیقهییەکانی ئیسلامدا وا هاتووە، شاعیر وەریگرتووەو هێناویـەتی ئـەو دێـڕەی خـۆی پـێ بەهێز کردوو.

ـ میحوەری ڕووحە و ڕەئیسی هەیئەتی بەزمی وجود

با وجوودا عەرشی ڕەحمانە ئەڵێن عینوانی دڵ... حەمدی

نیوە دێڕی دووەم لە گوتەی نەستەقی ئایینی: دڵی ئادەمیزاد عەرشی پەروەردیگارە، (قلب المؤمن عرش الرحمن) وەرگیراوەو بە هۆیەوەی شیعرەکەی بەهێز کردووە.

٤- لێیوەرگرتن لە پەندی پێشینان: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر پەندێکی پێشینان، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ چۆن بێسوودە، ئەو ناڵینە

بەرد هەر لەجێی خۆی سەنگینە... حەسەنی دانیشفەر

(بەرد هەر لەجێی خۆی سەنگینە) پەندێکی پێشینانە، شـاعیر وەریگرتـووەو بەهۆنراوەکـەی خۆی تێکەڵکردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی ژمـارەی بڕگـەکانی پەندەکـە، بڕگەیـەك لـە ژمـارەی بڕگەکانی هۆنراوەکەی خۆی کەمترە، بۆیە وشەی (هـەر)ی وەك بڕگەیـەك بـۆ پەندەکـە زیـاد کردووە و خستویەتییە ئەو شوێنەی کە کار لە واتای پەندەکە نەکات، بەوەش پەندەکە لێـرەدا بووەتە (بەرد هەر لە جێی خۆی سەنگینە).

٥- لێیوەرگرتن بە گوتەی ئامادە: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر گوتەیەکی ئامادە، کـە لـە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و شیعرەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ لە دەوری دوورییا پەستم دەروون پڕ دەرد و زوخاوم

ئەجەل دێ بمکوژێ نامناسێ چی بکەم نامرم و ماوم... پیرەمێرد

(چی بکەم نامرم) لە نیوە دێڕی دووەمدا، گوتەیەکی ئامادەی سەر زاری خەڵکی کوردە، شاعیر وەریگرتووە و هێناویەتی ئەو دێڕەی خۆی پێ بەهێز کردووە.

ـ سەرانسەر دونیا بدەیتە پاوە

چاوچاو ناوینێ ئەگوستە چاوە... کاک ئەحمەدی موفتی زادە

(چاوچاو ناوینێ) وتەی ئامادەیە، شاعیر وەریگرتووەو مەبەستەکەی خۆی بە هۆیەوە بەهێز کردووە، چ ئاماژەشی نەکردووە، کە ئەمەم وەرگرتووەو هی خۆم نییە.

٦ـ لێیوەرگرتن بە ئیدیۆم: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر ئیدیۆمێك وەردەگرێ، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە و شیعرەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ شا بە سەپانی خۆی ڕاناگرێ

ئەم سەرزەمینە بە فلسێك ناکڕێ... پیرەمێرد

(شا بە سەپانی خۆی ڕاناگرێ ) درکەیە (ئیدیۆم)ە لە وەسف، واتە: زۆر لە خۆی رازییە، شاعیر وەریگرتووەو هێناویەتی ئەو دێڕەی خۆی پێ بەهێز کردووە.

٧ـ لێیوەرگرتن لە گوتەی کۆن: لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر بەشێك لە گوتەیێکی کۆن، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و شیعرەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ با گرتن تەمی ترسم لا ئەبا

بریندار نەبێ شێر هەڵمەت نابا... پیرەمێرد

(بریندار نەبێ شێر هەڵمەت نابا) گوتەیەکی کۆنی کوردە، شاعیر وەریگرتووەو بە دێڕەکەی خۆی تێکەڵکێش کردووە.

٨- لێیوەرگرتن لە وتەی نەتەوەکانی تر.. لێرەدا قسەکەر، یان شاعیر بەشێك لە گوتەی نەتەوەیەکی تر، کە لە رستەیەکی تەواو کەمتر نییە، وەردەگرێ و قسەکەی خۆی پێ بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

ـ واتەی (عەزیزی) دوور و گەوهەرە

بەڵام کیم ئوقلەر و کیم دیکلەرە... پیرەمێرد

(کیم ئوقلەر و کیم دیکلەر) وتەیەکی تورکییە، واتە: کێ دەیبیسێ و کێ بە قسەی دەکات، شاعیر هێناویەتی بەو دێڕەی خۆی تێکەڵکردووە.

### تێکهەڵکێش:

(تێکهەڵکێش) لە عەرەبیدا (التضمین)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە تێکهەڵکێش کردنی رستە و گوتەی یەکێکی تر بەو هۆنراوەیەی شاعیرێك لە نوێ دایدەرێژێت، جا گوتە و رستەکە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بێت، یان فەرموودەیەکی پێغەمبەری خۆشەویست بێت (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، یان پەندێکی پێشینان، یان نیوە دێڕ و دێڕە هۆنراوەی شاعیرێکی تر، یان تەنانەت شیعرێکی تەواوی شاعیرێکی تر، یان هەر دەربڕینێکی تربێت، بەو مەرجەی لە سنووری رستەیەکی سادە کەمتر نەبێت و ئاماژەش هەبێت، کە ئەم رستەیە وەرگیراوە و بەشێکی دیکە نییە لە گوتاری خودی شاعیرەکە.

ئەم هونەرە یەکێکە لە هونەرە وشەییە دەوڵەمەندەکانی (جوانکاری)، چ ئەوانەی لەسەر کێشی عەموودی، چ ئەوانەی لەسەر کێشی ئازادیش شیعریان هۆنیبێتەوە، لە شیعرەکانیاندا بەرجەستە دەبێت، هەروەها لە (پەخشان)یش نووسەر پەنای بۆ دەبات، نووسەر زۆرجار وتەکانی خۆی لەم رێگەیەوە بە وتەی کەسانی تر بەهێز دەکات.. بۆ نموونە:

- ڕۆژوو ئەگری کەچی لە نوێژ بێزراوی
بە فتوای شێخ یەکانەی دەم بەستراوی... پیرەمێرد

(یەکانەی دەم بەستراو) وتەی زانایانە شاعیر وەکو خۆی وەریگرتووەو بە دێڕەکەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

### جۆرەکانی (تێکهەڵکیش):

١- تێکهەڵکێشی (قورئانی پیرۆز): لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، ئایەتێکی قورئانی پیرۆزە.. بۆ نموونە:

- دوور لە بانگەکە ئەمەم هاتە بیر
﴿أَنكَرَ ٱلأَصْوَاتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ﴾... پیرەمێرد

﴿أَنكَرَ ٱلأَصْوَاتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ﴾ کە لە نیوە دێری دووەمدا هاتووە، بەشێکە لە ئایەتی پیرۆزی ﴿وَٱقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ ٱلأَصْوَاتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ﴾ ئایەتی ژمارە (١٩)ی سورەتی پیرۆزی (لقمان)ە، شاعیر وەریگرتووەو بە شیعرەکەی خۆی تێکهەڵکێشکردووە، ئاماژەش ئەوەیە، کە هاتەوە بیرم، واتە هی خۆم نییە و ئەوەم

نەیرماتەوە کە زووتر بیستبووم، لە قورئانی پیرۆز، بەڵام قورئانی پیرۆزەکە کورتکراوەتەوەو لەبەر کێشی شیعرەکە نەهاتووە.

ـ عیلمە سەرمایەی سەعادەت، پایەیی عالم بڵند
﴿یرفع الله الذین أمنوا﴾ نەصصون جەلی... سەید ئەحمەدی نەقیب
﴿یرفع الله الذین أمنوا﴾ بەشێکە لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿يَاأَيُّهَا ٱلَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُواْ فِى ٱلْمَجَالِسِ فافْسَحُواْ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَانشُزُواْ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ آمَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾.. (المجادلة:١١).. شاعیر وەریگرتووەو مەبەستەکەی خۆی پێ بەهێزکردووە.

٢- تێکهەڵکێشی بە (فەرموودە): لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، فەرموودەیەکی پێغەمبەری سەروەرە (درود و سڵاوی خودای لەسەر).. بۆ نموونە:

ـ بۆچی فەرمووییەتی نەبیی ئەمین
(اطلبوا العلم ولوبالصین)... حاجی قادری کۆیی
(اطلبوا العلم ولوبالصین) یەکێکە لە فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەری ئیسلام (درود و سڵاوی خوای لێ بێ)، شاعیر وەك و خۆی وەریگرتووەو بە هۆنراوەکەی خۆی تێکهەڵکێشی کردووە.

٣- تێکهەڵکهێشکردن بە وتەی ناوداران: لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، وتەی یەکێکە لە ناوداران.. بۆ نموونە:

ـ سەیری ئەمانە کە، هەمووی کوردی صەف شکەن
گیانیان پێشکەش ئەکرد و ئەیان گوت: بژی وەتەن... پیرەمێرد
(بژی وەتەن).. وتەی شێخ سەعیدی پیران و دکتۆر فوئاد و شێخ قادری هاوەڵیان و هاوەڵانی تریانن، کە لە ٢٤ی ئایاری ١٩٢٥ حکوومەتەکەی (ئەتاتورك) بە نارەوا لە سێدارەی دان، ئەوان بەو دروشمەوە بەرەو پەتی سێدارە دەچوون، شاعیر هێناویەتی بەو دێرەی خۆی تێکهەڵکێشکردووە.

٤ـ تێکهەڵکهێشکردن بە شیعرێکی تـر: لێـرەدا ئـەو دەقـەی وەرگـیراوەو بـە شـیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێـت، دێـڕ، یـان بەشـێکی شـیعری شـاعیرێکی دیکەیە.. بۆ نموونە:

ـ لە دو ئاواندا کە یەك دەکەوی

وەك دوو میسرەعی فەردی مەولەوی

سیروانی ئەم چەم، تانجەڕۆی ئەو چەم

بدەن وەهەمدا ئەم چەم تا ئەو چەم ... پیرەمێرد

لەم دوو دێڕەدا شاعیر هاتووە دێڕی دووەمی (مەولەوی)ی هێناوە، کە بریتییە لە:

(سیروانی ئەم چەم، تانجەڕۆی ئەو چەم

بدەن وەهەمدا ئەم چەم تا ئەو چەم)و بەو پارچەیەی خۆی تێکهەڵکێشکردووە.

ـ مانگت ئەوا گیرا وەکو حەمدی ئەڵێ تا بەر ئەبێ

هەر لە تەشتی سینەیی زامار و تەپلی سەر ئەدەم... عەلی کەمال باپیر

نیوە دێڕی دووەم هی (حەمـدی) شـاعیرە، عـەلی کـەمال بـاپیر ئاغـا وەریگرتـووەو بـە شیعرەکەی خۆی تێکهەڵکێشی کردووە.

چەند جۆرێکی تێکهەڵکێشی بە شیعر

تێکهەڵکێشی بە (شیعرێکی تر) چـەند جۆرێکـە: لەوانـە: جـاری وا هەیـە شـاعیر نیـوە دێڕێکی شاعیرێکی تر دێنێ و بە هۆنراوەکەی خـۆی تێکهـەڵکێش دەکـات.. جـا یـان بـەبێ دەستکاری وەك بۆ وێنە:

ـ (گوتت: چۆنی؟ چلۆنت تێگەییێنم؟)

ئەشێ دوای جوانە مەرگان، جوان بمێنم؟.. حەسەنی دانیشفەر

نیوە دێڕی یەکەمی ئەم دێڕە هۆنراوەیە، (گوتت، چۆنی؟ چـلۆنت تێگـەییێنم؟) هـی (هـێمنی موکریانی)یە، شاعیر وەریگرتـووەو بـەبێ دەسـتکاری بـە هۆنراوەکـەی خـۆی تێکهـەڵکێش کردووە.

جاری واش هەیە شاعیر ئەو نیوە دێڕەی وەریدەگرێ بە هۆیەك لە هۆیەكان كەمە دەستكارییەكی دەكات، بۆ وێنە:

ـ كەوابو ئەی (هەژار) هەستە

(موژدەبێ وەتەن سەربەستە).. حەسەنی دانیشفەر

نیوە دێڕی دووەمی ئەم دێڕەی سەروو (موژدە بێ وەتەن سەربەستە)

هی (هەژاری موكریانی) شاعیرە، وەڵامە بۆ شیعرێكی (هەژار) خۆی كە بەر لە مردنی دەڵێت:

ـ توخوا كاتێ كە ئازادی و سەند

ڕەگەزی خوێن مژەكان و هەڵقەند

كیژ و كوڕ هەرچی بەلاما لادا

پێم بلّێ و پایێ بە قەبرم دادا

ئەی (هەژار) بەسییەتی مردن هەستە

موژ دەبێ مەوتنەكەت سەربەستە... هەژاری موكریانی

دوای ڕاپەڕینیش كە كوردستانی عێراق بە ئازادی دەگات، ئیتر وەك وەڵامێك بۆ شیعرەكەی (هەژاری موكریانی) ، (حەسەنی دانیشفەر) شیعرەكەی خۆی دەنووسێ و وەك موژدەیەك (موژدە بێ مەوتنەكەی سەربەستە)ی لێوەر دەگرێ و بە شیعركەی خۆی تێكهەڵكێش دەكات، تا هەواڵ و مزگێنی ئازادبوونی وڵاتی پێ ڕابگەینێت، بەڵام لەبەرئەوەی شیعرەكەی (هەژار)، (دە) بڕگەییە و شیعرەكەی (حەسەنی دانیشفەر)یش (هەشت) بڕگەییە، بۆیە (حەسەن)ی شاعیر ناچارە نیوە دێڕەكەی (هەژار) بە كەمە دەستكارییەك بەو مەرجەی دوو بڕگەی كەم كاتەوە، واتاش وەك خۆی بمێنێ وشەی (مەوتنەكەت)ی كە (چوار) بڕگەیە، بە (وەتەن) بۆ دەگۆڕێ كە (دوو) بڕگەیە، بەمەش تێكهەڵكێشییەكەی سەركەوتووانە دادەڕێژێت.

٥- تێكهەڵكهێشكردن بە گوتەی باوی نێو بازاڕ: لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەكە تێكهەڵكێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر بێت، گوتەیەكی سەرزاری نێو بازاڕە.. بۆ نموونە:

ـ بە عارەبی صاف، بە دەنگێكی ڕەق

ئەیگوت: ادخنوا من دخان الشرق... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی دووەم (ادخنوا من دخان الشرق) وتەی ئەو مندالّە پاکەتفرۆشە عەرەبەیە، کە شاعیر لە بازاڕی بینیوە، بەم گوتەیەی پڕوپاگەندەی بۆ پاکەتەکانی خۆی کردووە، تا خەڵك لێی بکڕن، شاعیر وەکو خۆی هێناویەتی بەو دێڕەی خۆی تێکهەڵکێشکردووە.

٦ـ تێکهەڵکێشی بە پەند، یان قسەی نەستەقی پێشینان: لێرەدا ئەو دەقەی وەرگیراوەو بە شیعرەکە تێکهەڵکێشراوە بۆ ئەوەی جوانتر و بەهێزتر بێت، پەندێکی پێشینانە.. بۆ نموونە:

خۆتان دەڵێن: ئەگەرچی مەشهوری خاص و عامە

هەر ڕێوییەك گەڕابێ ئازاترە لە شێران... حاجی قادری کۆیی

هەر ڕێوییەك گەڕابێ ئازاترە لە شێران.. گوتەی نەستەقی پێشینانە و شاعیر بە شیعرەکەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.

ـ لاوی کورد مەردە لە مردن قەتعیەن باکی نییە

پەندی پێشینانە ڕاستە ( بەرخی نێر بۆ سەربرین)... پیرەمێرد

لە نیوە دێری دووەمدا (بەرخی نێر بۆ سەربرین) پەندێکی پێشینانە شاعیر هێناویەتی و بە شعرەکەی خۆی تێهەلکێش کردووە.

ـ چلکی دەستە ماڵی دنیا وەك دەلێن

ماڵپەرست پەیمان شکێنە و بێ بەڵێن... هێمنی موکریانی

لەنیوە دێری یەکەمدا (چلکی دەستە ماڵی دنیا)، پەندێکی پێشینانە شاعیر هێناویەتی و تێکهەلکێشی پێ کردووە.

ـ تۆز لە قوڕ هەڵناستێ قسەی پێشوو تەواوە

نێرە گورگ چۆن دەزێ؟ لە کام مێژوودا زاوە... سامی عەودال

لە نیوە دێری یەکەمدا (تۆز لە قوڕ هەڵناستێ)، قسەییکی نەستەقی پێشینانە شاعیر هێناویەتی و تێکهەڵکێشی پێ کردووە.

## جیاوازی نێوان لێیوەرگرتن و تێکهەڵکێش:

لێیوەرگرتن ئەوەیە ئاخاوتن شتێك لە قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، یان پەندی پێشینان، یان هەر باسێکی تر لە خۆ بگرێ، بێ ئەوەی ئاماژەی بۆ ئەوە بکات، کە ئەمانەی لە کوێ وەرگرتووە، بەم تێکهەڵکێش کە شتێ لەمانە وەردەگرێ، ئاماژەی بۆ دەکات، کە ئەم وەرگیراوە هی فلانە سەرچاوەیە.

کەوابێ ئەگەر بەرهەمێك ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەییێکی لە خۆیدا هەڵگرتبوو، ئاماژەیشی کردبوو، کە ئەوە ئایەتی پیرۆز، یان فەرموودە، یان هەر شتێکی دیکەیە، ئەوە لێیوەرگرتن نییە و تێکهەڵکێشە. بۆ نموونە حاجی قادری کۆیی فەرموودەی هێناوەتە نێو شیعرەکەی و گووتوویەتی:

بۆچی فەرموویەتی نەبیی ئەمین
(أطلبوا العلم ولو بالصين)
نێر و مێ لەو حەدیسە فەرقی نییە
گەر مەلا نەهیی فەرموو دینی نییە... حاجی قادری کۆیی

ئەمە تێکهەڵکێشە بە فەرموودە، چونکە ئاماژەی کردووە، ئەوەی وەریگرتووە فەرموودەیە.

بەڵام هەمان ئەو فەرموودەیە (بێکەس)ی شاعیر دەیهێنێت و بە هۆیەوەی مەبەستە شیعرییەکەی دەوڵەمەند و بەهێز دەکات، کەچی شێوازی وەرگرتنی فەرموودەکەی لێیوەرگرتنە و تێکهەڵکێش نییە، ئەوەتا دەڵێت:

(أطلبوا العلم ولو بالصين)ی گەر تێبگەی تەمام
قەتعییەن تەحصیلی عیلم و مەعریفەت ناکەی حەرام... بێکەس

٢- لێیوەرگرتن جوانتر و کورتتر و شێوازەکەی لە تێکهەلکێش بەهێزترە.

**هاوبڕی:**

عەرەب (الموارده)ی پێدەڵێن.. ئەم شێوازە لەوەدا بەرجەستە دەبێت، کە دوو کەس لە دوو شوێنی جودا، بێ ئەوەی ئاگایان لە یەك بێ، بە یەك زمان، یان بە دوو زمانی جودا، هەمان شت بڵێن.. بۆ نموونە:

مەلای جزیری لە دێڕێکی فەلسەفی بەرزی گوتوویەتی:

ـ حوسن و جەمالی جانان، نادێرتن تو پایان

هەرچی نەبن بیدایەت، ئەصلەن نەهن نیهایەت... مەلای جزیری

لەولاوە شاعیرێکی عەرەب، کە شیعرەکەی لە لایەن (نەبیل شعیل)ی کوەیتی کراوەتە گۆرانی، گوتوویەتی:

ـ اللي ما لو أول

أكيد ما لو تالي... نبيل شعيل

تەماشادەکەین ئەم شیعرە عەرەبییە و ئەو نیوە دێڕەی دووەمەی مەلای جزیری، تەواو یەك شتن و دەڵێی وەرگێڕدراوی یەکن، بەڵام ماوەیەکی زۆریش لە نێوانیاندا هەیە، ئەوەش کەوابێ لە یەك وەستەدا هەردوو شاعیر ئەقڵیان هەمان شتی بڕیوە، بۆیە هەمان شتیان گوتووە.

**نەسخ:**

لە ڕەوانبێژی کۆندا جۆرێك بووە لە دزی شیعری (السرقات الشعريه)، بریتییە لە نووسینەوەی دەقێك، کە لە هەردوو ڕووی وشە و واتاوە ئاشکرا دیاربێ ئەم دەقە نوێیە لە دایکبووی دەقێکی دیکەی پێشە خۆیەتی و بە هۆی ئەوەوە بەرهەمهێنراوە.. بۆ نموونە:

ـ تا قییامەت من مەنتباری غەمی هیجرانی تۆم

ئەو دەخۆم و عامییانە نیم بە تەنگی قووتەوە... حەمدی

ئەمە دێڕێکی (حەمدی) شاعیرە، کە لەگەڵ دێڕێکی هاوشێوەی (نالی) بەراوردی دەکەین، دەبینین تا ڕادەیێکی زۆر نەسخی شیعرەکەی (نالی)یە، کە تیایدا دەڵێت:

ـ گەر دەپرسی من لەبەرچی کەم دەخۆم

من بە برسی قەت مەزانە غەم دەخۆم... نالی

دیاره راسته حەمدی جێ پەنجەی خۆی بەسەر دێڕەکەی خۆیەوەی دیاره و شتێکی زیاتری لە نالی گوتووه، بەڵام لەولاشەوه زۆربەی واتاو وشەکانی لە نالی وەرگرتووەو بە هۆیانەوه دێڕەکەی خۆی هۆنیوەتەوه.

ئەم شێوازه دیاره وەکو ئاماژەمان پێیکرد، لە کۆندا بە (دزی شیعری) وەسفکراوه و پەسندنەکراوه، ئەوەش راستییەکی حاشاهەڵنەگره و دەشێ زۆر شاعیر بە تایبەتی لە رۆژی ئەمڕۆ بەم هۆیەوه لەسەر حسێبی داهێنانە گەورەکانی پێشەخۆیان، شتانێك بە ناوی خۆیانەوه تۆمار بکەن، بەڵام لەولاشەوه ئەگەر بێت و وەکو ئەوەی حەمدی بە جوانی وەرگرتنەکە بکرێت و بە داهێنانەوه مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، ئەوا دەبێتە هۆییێك بۆ نوێبوونەوەی کۆنەکان و بەرگێکی تازه بەبەر هەندێ شتی جواندا دەکاتەوه، ئەوەش جوانییەك و چێژێکی ئەدەبی خۆشی بۆ زامن دەکات.

لە دێڕێکی دیکەدا حاجی قادری کۆیی لە وەسفی خودای گەوره و میهرەباندا نووسیویەتی:

- مەعلومە بۆچی حاجی مەدحت دەکا بە کوردی
تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوه مەدحی باری... حاجی قادری کۆیی

رەشاد موفتی لە مەولودنامەکەی خۆیدا، دێت فیکرەی تەواوی ئەو دێڕه، تەنانەت بە گەلێك لە وشەکانی ئێرەش دەخاتە نێو وەسفەکانی خۆی و دەنووسێ:

- بەو زمانی کوردییەی شیرین زمان
بەحسی گەورەی هەردوو عالەم کەم بەیان
با نەڵێن کوردی نییە مەدحی نەبی
من وەهام نووسی کە کەس قسەی نەبی... رەشاد موفتی

دەبینین ئەمەی رەشاد موفتی نەسخی ئەوەی حاجی قادری کۆییە، بەڵام هێندە هەیە، لای حاجی کورتتر نووسراوه و باسی مەدحی خودای تەبارەك و تەعالایە، بەڵام لێرەدا لای رەشاد موفتی باسەکە درێژتره و مەدحی پێغەمبەره (درود و سڵاوی خودای لەسەر).

## پێنج خشتەکی:

ئەمە هونەرێکی شیعری فارسییە، شاعیرانی کلاسیکی کوردیش پەیڕەوییان لێیکردووە، هەمیشە هونەرێکی شیعری تێکهەڵکێشکراوە، چونکە بیناى ئەم هونەرە شیعرییە بەوە دەبێت، شیعرێکی ناوداری شاعیرێك وەربگیرێ و بکرێتە بناغە بۆ شیعرێکی پێنج خشتەکی نوێ، لەو پێنج خشتەکییە نوێیە هەمیشە و بە ریز دێڕی یەکەمی شیعرە بەناوبانگەکە دەکرێتە بناغەی پێنج خشتەکی یەکەم و سێ نیوە دێڕی بۆ دەخرێتە سەر، ئینجا دێڕی دووەمی شیعرە ناودارەکە دەکرێتە بناغەی پێنج خشتەکی دووەم و شاعیری خاوەن پێنج خشتەکییەکە سێ نیوە دێڕی تر دەخاتە سەر ئەویش، بەم شێوەیە تا شیعرە ناودارەکە دەگاتە کۆتایی، هەر دێڕێکی بە ریزە دەبێتە بناغەی پێنج خشتەکییەکی شیعرە نوێیەکە، ئەوەش کەوابێ هەموو شیعرێکی پێنج خشتەکی شیعری تێکهەڵکێشە و لە (پێنجین جیایە، کە لە پێنجیندا هەموو پێنج دێڕەکان هی خودی شاعیرەکەن)، هەر لەبەر ئەوەشە ئەم شێوازەی نووسینی شیعرە وەکو یەك لە هونەرە جوانکارییە وشەییەکان دەتوانرێ بژمێردرێ و لە کوردان هەیە، خستوویەتییە خانەی هونەرە جوانکارییەکان.. جوانی ئەم هونەرەش لە چەند شتێکدایە، لەوانە:

١ـ جەختکردنەوە لەسەر واتا بەهێز و جوانەکانی پێشوو، کە شاعیرانی پێشوو پێشکەشیان کردووە.

٢ـ فراوانکردنی وێنە شیعرییە کۆنەکان.

٣ـ بەرەوپێشبردنی بیر و ڕامانە پێشووەکان.

٤ـ بەرەوپێشبردنی ئەزموونە کەسییە سەرکەوتووەکان.

٥ـ تێکەڵاوکردنی داهێنانی نوێ بە کۆن.

گەلێ لە شاعیران سوودی زۆریان لەم هونەرە وەرگرتووە، یەك لەو شاعیرانە (حەمدی)یە، سوودی زۆری لەم هونەرە وەرگرتووە و هاتووە شیعری (مەحوی) و (سالم) و (کوردی) و (حافزی شیرازی) و هی دیکەی وەرگرتووە و کردوونی بە بناغە بۆ پێنج خشتەکییەکانی، ئەمانەی خوارەوە نموونەی هەندێ لە پێنج خشتەکییەکانی (حەمدی) نە:

**١ـ پێنج خشتەکی حەمدی لەسەر شیعری مەحوی:**

بە سەرما پێ دەنێ لەم ئەرزەدا بێ ڕێم دەڵێ یا شێخ

به دەستی کەوتە کار عادەتیەتی جێ پێم دەڵێ یا شێخ
دەڵێی نورە لە فانۆسی دڵا بێ جێم دەڵێ یا شێخ
چ شۆخە ئاگرم تێبەردەدات و پێم دەڵێ یا شێخ
بە خاشاکی دەوت شوعلە عەسامە دەستی پێ دەگرم... حەمدی
سێ نیوەدێڕی یەکەم هی (حەمدی) و دوو نیوەدێڕەکانی چوارەم و پێنجەم هی (مەحوی)نە، بەمە پێنج خشتەکییەکی تێکهەڵکێشکراو درووستبووە.

**٢ـ پێنج خشتەکی حەمدی لەسەر شیعری سالم:**

چ موشتەعیل چ موزلێم ئەجرامی ئەرز و کێوان
جوملە میسالی شەونم مەحون بە ڕۆژی ڕەخشان
لەم ئەمرەدا ئەڕستۆ بڕوانی چی بە دەستە
تیماری چاکی سینەم ڕاجیع بە چاوی مەستە
بەختیش موافقی عیشق بۆ من خراپی هێنا... حەمدی
سێ نیوە دێڕی یەکەم هی (حەمدی) و دوو نیوە دێڕەکانی چوارەم و پێنجەم هی (سالم)ن، بەمە پێنج خشتەکییەکی تێکهەڵکێشکراو دروستبووە.
دیارە هەروەها حەمدی لەسەر شیعری (کوردی و حافزی شیرازی)ش پێنج خشتەکی داناوە، لەبەر درێژبوونەوە نموونەمان لێیان وەرنەگرت.

**٢ـ دوو پێنج خشتەکی بێبەش لەسەر شیعری هەردی و بێکەس:**

ـ بە دەستی خۆی لەدەستیدا، کەچی ئێستا پەشیمانە
ئەڵێ چیم کرد، لەگەڵ خۆما، لە بۆ نامەردی بێگانە
بەرم دەن، باوەڵامی دەم، بڵێم پێی، مەرد و مەردانە
(بەدەستی خۆت کە جامت خستە سەر لێوت خەشیمانە
ئەگەر ژەهریش تێدابوو، گوناهی خۆتە بیزانە).. بێبەش
ئەم پێنج خشتەکییە، سێ نیوە دێڕی یەکەمی هی (بێبەش)ە، دوو نیوە دێڕەکەی تریش هی (هەردی)یە، (بێبەش) وەك بناغەیەك بۆ پێنج خشتەکییەکەی خۆی هێناوییەتی و بە

شیعرەکەی خۆی تێکهەڵکێشی کردووە.

جاری تریش شاعیر چەند دێڕێکی هۆنراوەی شاعیرێکی تر وەردەگرێ و هەر دێڕێکی دەکاتە بناغەی پێنج خشتەکییەکی خۆی بۆ وێنە:

- بەبێ مەی مەستەکی مەستم، دڵم یەکجاری غەمناکە
چ کەس نابێتە خزمی کەس، زەمانێکە کە ئێستاکە
هەزار سوندم بە زاتی خوای نییە تاکی، بەبێ تاکە

(سەرم سوڕماوە نازانم چ شەخصێ بێ غەش و چاکە
لە ناو ئەو قەومەدا کێ یە، لەگەڵ هاوجنسی خۆی پاکە؟!)

لە خەڵکی لادە، خۆت لادەی، ئیتر نابین شکستی تۆ
زەرەر نابینی، نابینن زەرەر خەڵکی لە دەستی تۆ
ئەڵێم گەر خاوەنی هەستی، هەیە یەك زەڕڕە هەستی تۆ
(لەلام واباشە ئێستاکە بە کەس پشتی نەبەستی تۆ
لەخزم و دۆست و ئاشنایان هەتا دەتوانی هەر ڕاکە)

لەوان دەرکەوت و دوورکەوتبە، هەتا ئەتوانی تۆ لێیان
لە ڕێیان لادە بێ ڕێنە، ئەگێڕی چاکەیی کێیان
(ئەقاریب کەلعەقاریب) ڕاستە (بێکەس) نێرە گەرمێیان
(کەس و کارت وەکو مارن، ئومێدت هیچ نەبێ پێیان
لەژێر سایەی ئەوان دەرچوو، برادەر خۆتی لێ لاکە).. بێبەش

سێ دێڕەکانی یەکەمی هەر پێنج خشتەکییەك هی (بێبەش)ەو دوو نیوە دێڕەکانی نێو کەوانەو دامێنی ئەو پێنج خشتەکییانەی سەرەوەش، هی (بێکەس)ی شاعیرن، ئەو لە شیعرێکیدا ئەوەی گوتووە کە پێنج دێڕە، ناونیشانەکەی بریتییە لە (کە پارەت بوو خزم زۆرە)، (بێبەش) ئەم سێ دێڕەی لێوەرگرتووەو هێناونی وەك بناغەیەکی پێنج خشتەکییەکانی خۆی، تێکەڵ بە هۆنراوەکەی خۆی کردووە.

**٣ـ پێنج خشتەکی بێکەس لەسەر شیعری پیرەمێرد**

جاری واش هەیە شاعیر تەواوی شیعری شاعیرێکی تر وەردەگرێ و هەر دێڕێکی دەکاتە بناغەی پێنج خشتەکییەکی خۆی.. بۆ وێنە:

ـ قەدری میللەتتان بە جارێ شکان

نەحەیاتان ما، نە ناوونیشان

باری تەعنەتان، واهاتە سەرشان

(وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان

هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان)... بێکەس

ئەم پێنج خشتەکییە یەکێکە لەو حەوت پێنج خشتەکییانەی (بێکەس)ی شاعیر، کە لەسەر بنەمای شیعرێکی حەوت دێڕی (پیرەمێرد)ی شاعیرەوە هۆنیویەتییەوە.. (بێکەس) هەر حەوت دێڕە هۆنراوەکەی لە (پیرەمێرد) وەرگرتووە، هەر دێڕێکی کردووەتە بناغەی پێنج خشتەکییەکی، بەم شێوەش تەواوی شیعرە وەرگیراوەکەی، بە هۆنراوە پێنج خشتەکییەکەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە.. کە لەبەر درێژی لێرەدا هەر ئەو پارچەیەی سەرەوومان بەباش زانی.. بۆ لێوردبوونەوەی زیاتریش دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ هۆنراوەکەی (بێکەس) لە دیوانەکەی خۆیدا.

**٤ـ پێنج خشتەکی حەیدەری لەسەر شیعرێکی ئەحمەد حەمدی بەگی صاحێبقڕان:**

ـ وەکو فەرهادی خۆکوژ ڕوو لە کێوم

هەموو دەم هەر گەریدە و سەر بە خێوم

بە ڕەنگی زەردەوە بە وشکی لێوم

(ئەماشاکەن قوڕێکی شل دەپێوم

لە کاسەی دیدە خوێنی دڵ دەپێوم)... حەیدەری

پێنج خشتەکی رازی لەسەر شیعری ئەخۆل:

ـ لە یادت دەرنەچم هەرگیز کە مەرگی جوانی چەن تاڵە

سەرم دانێ لەسەر ڕانت کە شەنگم حاڵم بێ حاڵە

سەیری باڵای نەمامم کە، کە هێشتا بەرهەمی کاڵە

(ئەوا جێت دێڵم ئەی دایە بە عومری بیست و یەك ساڵە

لە بێخ و ڕیشە دەرهاتم وەکو لالە و گوڵی ژاڵە)... ڕازی

تێبینی:

دەبێ ئەوە بگوترێ لە تێکهەڵکێشی پێنج خشتەکی مەرج نییە لە ناو هۆنراوەکە بگوترێ ئەم دوو دێڕەی کۆتایی پێنج خشتەکییەکان هی یەکێکی دیکەن، چونکە لێرەدا باو وایە لە سەرووی هۆنراوەکە دەنووسرێ: پێنج خشتەکی فلان لەسەر هۆنراوە، یان بەیتێکی فلان.

## چوارخشتەکی تێکەڵ:

ئەگەر پێنج خشتەکی حسێبی تایبەتی بۆ بکرێت، ئەوا چوارخشتەکی ئەو جۆرەی، کە لەسەر بنەمای شیعرێکی دیکەی شاعیرێکی تر بنیاتدەنرێت و شیعرێکی تێکهەڵکێش و پێکەوەییمان بۆ بەرجەستە دەکات، ئەوەش جێی خۆیەتی وەکو هونەرێکی پێکەوە گونجانی واتایی و پێکەوەگرێدانی بیر و ئەزموونی دوو شاعیر گرنگی تایبەتی پێبدرێت و وەکو هونەرێکی پێکەوەیی دەوڵەمەندکەر و جوانکردنی شیعر بۆی بڕوانرێت، بە بەرچاوگرتنی ئەمە، ناو لەو جۆرەی چوارخشتەکی، کە دوو شیعری تێکەڵکێش لەخۆدەگرێت دەنێم (چوارخشتەکی تێکەڵ) و وەکو هونەرێکی سەربەخۆ لە ریزی جوانکاری وشەییدا ریزی دەکەم.

چوارخشتەکی تێکەڵ: ئەو چوارخشتەکییەیە، کە ژمارەیێك چوارینی بەدوای یەك لەخۆ دەگرێت، لە هەموویاندا سێ نیوە دێڕی یەکەم هی خاوەنی چوارخشتەکییەکانە و نیوە دێڕی چوارەم لە شاعیرێکی تر وەرگیراوە، کراوەتە بناغە و لەسەر ئەوەوە بینای چوارخشتەکییەکە کراوە، ئەوەش هونەرێکی تێکهەڵکێشییە و لە بواری داهێنان و جوانکاری شیعریدا بەهای تایبەتی خۆی هەیە.. جوانی ئەم هونەرەش لەوەدایە:

١- دوو ئەزموون پێکەوە تێکەڵ دەکات.

٢- واتا فراوان و بەهێزتر دەکات و دەشێ بەڵگەی جوان و سەرنجڕاکێش بۆ ئەو گوتانە بێنێتەوە، کە لە شاعیرێکی دیکەی وەرگرتووەو کردوویەتییە بناغە بۆ چوارخشتەکییەکانی خۆی.

لە شیعری کلاسیکی کوردیدا نموونەی جوانی لەو جۆرە دەبینینەوە، هەندێ لەو نموونانە، بۆ وێنە:

١- حەمدی لە یەك لە چوارخشتەكییە تێكەڵكێشەكانیدا هاتووە، نیوە دێڕێكی شاعیری فارسی (حافزی شیرازی)ی وەرگرتووەو كردوویەتییە بناغە بۆ تەواوی چوارینەكانی، كە ژمارەیان حەوت چوارینە.. ئەوەتا لە یەكێكیاندا دەڵێت:

ـ نامەرد موغەننی وەقتی مەقاماتە نەسرەوی
توخوا قەتارێ خۆشە بە ئەبیاتی مەولەوی
یاخۆ بە سۆزی شۆرەوە بەیتێكی مەولەوی
(تا خواجە میخورد بغزلهای پهلوی)... حەمدی

نیوە دێڕی چوارەم هی حافزی شیرازی و سێ نیوە دێڕەكانی سەروو هی حەمدی خۆینە، بەوەش چوارخشتەكی تێكەڵ بەرهەمهاتووە.

٢- هەر حەمدی شاعیر لە یەك لە چوارخشتەكییە تێكەڵكێشەكانی تریدا هاتووە، نیوە دێڕێكی (فیردەوسی)ی شاعیری فارسیی وەرگرتووە، كردوویەتییە بناغە بۆ تەواوی چوارینەكانی، كە ژمارەیان نۆ چوارینە.. بۆ نموونە:

ئەگەر دەیبوو زەڕڕە وەفاو و هونەر
بسر بر نهادی مرا تاج زر
ئەنیسی سولەیمان ئەبووم هودهودی
اگر مادر شاه بانو بدی... حەمدی

نیوە دێڕی چوارەم هی فیردەوسی و سێ نیوە دێڕەكانی سەروو هی حەمدی خۆینە، بەوەش چوارخشتەكی تێكەڵ بەرهەمهاتووە.

٣- دیسانەوە حەمدی لە یەكێكی تر لە چوارخشتەكییە تێكەڵكێشەكانی تریدا، هاتووە نیوە دێڕێكی شاعیری دیكەی فارسی وەرگرتووە، ئەگەرچی ناوی شاعیرەكەی دیارینەكردووە، بەڵام كردوویەتییە بناغە بۆ تەواوی چوارینەكانی، كە ژمارەیان نۆ چوارینە.. بۆ نموونە:

شێخ كە پۆلیسی دەوێ و عەسكەری سوارە و پیادە
بۆ هەموو فیتنەو و شۆڕش كە بووە ئامادە
دەستی هەڵگرت لە خودا و دینی كە كرد ئازادە
(این همه از پی انست كە زر میخواهد)... حەمدی

نیوه دێڕی چوارەم هی شاعیرێکی فارسی نەناسراو و سێ نیوە دێڕەکانی سەروو هی حەمدی خۆینە، بەوەش چوارخشتەکی تێکەڵ بەرهەمهاتووە.



## رەنگامە، یان مولەممەع

لە (الملمع)ی عەرەبی وەرگیراوە.. عەرەبەکان کە تەماشای شیعری خۆیان کردووە، بینیویانە دەشێ شاعیرێك بێت، شیعر، یان دێڕە شیعرێکی بە زیاتر لە زمانێك بنووسێ، بۆیە بە بەرچاوگرتنی ئەم راستییە گوتوویانە: مولەممەع بریتییە لەوەی شاعیر لە شیعرەکەی خۆیدا نیوە دێڕێکی عەرەبی و نیوە دێڕێکی عەجەمی، یان دێڕێك لەم و دێڕێك لەو بهێنێت.. ئەوەش پێناسەیەکە تایبەتە بە مولەممەعی عەرەبی، لەبەر ئەوەو لەسەر ئەو بنەمایە لای کوردانیش وەها پێناسەی کراوە: بەو شیعرە دەگوترێ کە بە زمانێك زیاتر دەنووسرێ، واتە: بە دوو، یان سێ، یان چوار زمان دەنووسرێ.

بە کورتی: مولەمەع بریتییە لە شیعرێك، یان چەند دێڕێکی شیعر، کە بە زیاتر لە زمانێك نووسرابن، بەو مەرجەی بەکارهێنانی هەر زمانێك بۆ کەمتر لە نیوە دێڕێك، یان رستەییێك کورتنەبووبێتەوە، جا بە دوو زمان مولەمەعەکە نووسرابێ، یان بە سێ زمان، یان بە چوار زمان، هەروەها دەبێ هەموو شیعرەکەش هی خودی شاعیرەکە خۆی بن، نەك شتی لە شاعیرانی تر وەرگرتبێ، دەنا دەبێتە مولەممەعی تیکهەڵکێشراو.

### مولەممەعی داهێنراو و مولەممەعی تێکهەڵکێشراو:

ئەمانە دوو جۆری مولەممەعن، داهێنراوەکە ئەوەیە ئەو شیعرەی نووسراوەو مولەممەعکراوە، بە هەر چەند زمانێك بێت، هەموویان هەر لە داهێنانی شاعیرەکەن، بەڵام مولەممەعی تێکهەڵکێشراو ئەو مولەممەعەیە، کە دێڕ و نیوە دێڕەکانی بە چەند زمان نووسرابن، هی ئەوەندە کەس و لایەنەن.

#### ١- مولەممەعی داهێنراو:

وەکو گوترا مولەممەعی داهێنراو ئەو مولەممەعەیە ئەو شیعرەی نووسراوەو مولەممەعکراوە، بە هەر چەند زمانێك بێت، هەموویان هەر لە داهێنانی شاعیرەکەن.. بۆ نموونە:

ـ تمنيت من الدهر ندائى أزمنا نادى
گوتی: هەرچی تەمەنناکەی لە دنیا غەیری من نادا... حاجی قادری کۆیی
ئەم مولەممەعە بە دوو زمانی عەرەبی و کوردی نووسراوە، هەردوو نیوە دێڕەکان هی خودی حاجی قادری کۆیینە، بەوەش مولەممەعێکی داهێنراو دروستبووە.

ـ ئەی سەییدی جووان و جەوان مەرد و موحتەرەم
یا ناقص العطیة، ویا قاصر الهمم... مەلا مەعروفی کۆکایی
ئەم مولەممەعەش بە دوو زمانی عەرەبی و کوردی نووسراوە، هەردوو نیوە دێڕەکان هی خودی مەلا مەعروفی کۆکایینە، بەوەش مولەممەعێکی داهێنراو دروستبووە.

### جوانی ئەم هونەرەش لە چەند شتێکە، لەوانە:

١- شاردنەوەی هەندێ شت بە زمانەکانی دووەم و سێیەم و چوارەم، کە ئەم زمانانە لای خوێنەری ئاسایی و زۆرێکی خوێنەرانی باشیش دەشێ ئاشکرا نەبن، بەوەش شاعیر جوانییەکی واتایی بۆ شیعرەکەی بەرجەستە دەکات.

٢- هونەرێکە بۆ پیشاندانی دەسەڵاتی شاعیر بەسەر زمانەکان لە کلاسیکدا رەواجی پێدراوە.

٣- پڕکردنەوەی ئەو پێویستیانەی شیعر لە هەر زمانێك، کە بە تەنیا وشەکانی زمانە نەتەوەییەکە فریای شاعیرەکە ناکەوێت بۆ گەیاندنی ئەو واتایانەی دەیەوێت بییانگەیێنێت.

### جۆرەکانی مولەممەعی داهێنراو

بە پێی ژمارەی ئەو زمانانەی مولەممەعی پێ دەنووسرێت، چەند جۆرێکی مولەممەع هەیە، لەوانە:

١- مولەمەعی بە دوو زمان.. کە دەشێ یەکیان کوردی و ئەوی تریان عەرەبی بێ.. بۆ نموونە:

ـ ئەی بێ بەدەل و شەریك و تەنها
(ما أعظم شأنك تعالى)!... حاجی قادری کۆیی
ئەم مولەممەعە بە دوو زمانی کوردی و عەرەبی نووسراوە.

هەروەها دەشێ یەك لە زمانەکان کوردی و ئەوی دیکە فارسی بێ.. بۆ نموونە:

ـ فەقر و سەروەت بۆ بەشەر هەردوو گرفتاری نییە

میحنەتی جاری نییە

هر کرانبود تمنا بیشتر از اب و زاد

واقعا ازاد زاد... حەمدی

دێڕی یەکەم بە کوردی و دێڕی دووەمی ئەو موستەزادەی حەمدی بە فارسی نووسراون.

٢ـ مولەممەعی بە سێ زمان.. لێرەدا شیعرە مولەممەعەکە بە سێ زمان دەنووسرێت.. بۆ نموونە: مەحوی مولەمەعێکی بە سێ زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، لە پارچەیەکی هاوسەنگە، تیایدا دەنووسێت:

ـ مەحمودی (في السما)یە، حەبیبی خودایە ئەو

مەقبولی بارەگاهە، ئەوە موختار و موستەفا

(صلی علیه الاهنا ما یلیق به)

(مع صحبه واله والأهل ذي الصفا)

تشویش حال من تو ز تخلیط من بفهم

ز اهل زمانە بس کە رسد بر دلم جفا... مەحوی

ئەم پارچەیە مولەممەعێکی هاوسەنگە، بەڵام لە هۆنراوەکەدا هەمووی سێ زمانەکە بە هاوسەنگی نەهاتووە.

٣- مولەممەعی چوار زمانی.. بۆ نموونە:

دریغ و حسرت أزان شاهباز سدرەنشین

بدام مرگ فتادو بخاك گشت دفین

ز لوحەئی خەتتی مەوزون قتعەیی مەنزوم

خجل شد ئیبن هیلال و روان ئیبن مەتین

بە کێ بڵێم کە بە کەیفی بڵێ بە کەیف و سرور

عەمی نەبیٚ لە فەلەك عاكیفانی چللەگوزین
جنوبهم تتجافى عن مضاجعهم
يستغفرون لك بالغدو حتى حين
علي تعلو بأعلى الجود عبرتنا
مدى الزمان أنواع نياح منتدبين
اوطون كة اسب كلامى زمانة ايلدى زين
كف كفايتى كيفية ويرديلر دزطين
بوطيجة كيفى افندى طورندى رئوبادية
**جنانده زمزه غلمان و حوره اولدى يقين... حاجی قادری کۆیی**

ئەم مولەممەعە بە چوار زمانی فارسی و کوردی و عەرەبی و تورکی نووسراوە.

**جۆرکانی مولەممەعی داهێنراو**

١ـ مولەممەعی هاوسەنگ: ئەوەیە شاعیر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، بە ڕێکی دوو، یان سیٚ، یان چوار زمان بەکاربێنیٚ.. بۆ نموونە:

نالی شاعیر لە پارچەیەکیدا بە دوو زمانی کوردی و عەرەبی دەنووسێت:

ـ يا بدر علوا وحياوا وكمالا
فالغصن مع الأصل الى فرعك مالا
تا سونبلی زولفت لە نیهالی قەدت ئالا
من دوودی هەناسەم گەییە عالەمی بالاٚ
ما عاد لك البان ولا اللينة لينا
اذ عد لك الباريء حسنا وجمالا
من گریە ئەتۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین
من لەعلی بەدەخشان و ئەوتۆ لوئلوئی لالا... نالی

٢ـ مولەممەعی لاسەنگ: مەبەست لێی ئەو مولەممەعەیە، کە ئەو زمانانەی لە شیعرەکە بەکارهاتوون، بە قەد یەك بەکار نەهاتبن.. بۆ نموونە:

ـ سلام الله منی كل یوم
له ئەصحابانی صاحێب غیرەت و دین
له بێ عاری هەموویان کەوتە یادم
ڕموزی ئیتتیحاد و ئیتتیفاقم... حاجی قادری کۆیی

ئەم دوو دێڕە بەشی پێشەوەی قەسیدەییێکی حاجی قادری کۆییە، کە پێکهاتووە لە (٣١) دێڕە شیعر، تەنها نیوە دێڕی سەرەتای یەکەم دێڕی قەسیدەکە بە عەرەبی نووسراوە، ئەوی دیکەی هەمووی بە زمانی کوردی نووسیوە، بەوەش مولەممەعی لاسەنگ دروست بووە.

ـ بە قەسسابی وت مەڕ منت کەندووە پۆست
مەحاڵە ئیتر کەس بە تۆ بێتە دۆست
سەرەوژێری دەستی دەکا باوەشێن
تواچو ز گردن فرازان نیکوست... حەمدی

لەم چوارینەیدا (حەمدی) دوو زمانی کوردی و فارسی بەکارهێناوە، بەڵام بە هاوسەنگی بەکاری نەهێناون، دەبینین سێ نیوە دێڕی یەکەم و دووەم و سێیەمی بە زمانی کوردی نووسیوە، تەنیا نیوە دێڕی چوارەمی بە زمانی فارسی نووسیوە.

## ٢ـ مولەممەعی تێکهەڵکێشکراو:

بریتییە لەو هونەرەی لە نێوان (مولەممەع) و (تێکهەڵکێش)دایە، لە لاییێك (مولەممەع)ەو لەولایشەوە (تێکهەڵکێش).. ئەمە بەوە پێکدێ، کە شاعیرێك گوتەی کەسێك، یان دوو سێ کەسی نەتەوەکانی دیکە، یان شیعری شاعیرێك، یان دوو سێ شاعیری نەتەوەکانی تر وەربگرێ و بە زمانی نەتەوەیی خۆیان، ئەو گوتە و دێڕە وەرگیراوانە بە شیعرەکەی خۆی تێکهەڵکێش بکات.

عەزیز گەردی تێبینی کردووەو ئاماژەی بەوە داوە، کە: زۆرجار مولەممەع و تێکهەڵکێش بە ناو یەکدا دەچن. بۆیە پێشنیاری ئەوە دەکات، کە ئەم جۆرە خانەییێکی تایبەتی لە نێوان هەردوو هونەر بۆ دابنرێ و بە ناوێکی سەربەخۆ جیابکرێتەوە، بەڵام لەوە زیاتر لە بارەی ئەم جۆرە نەنووسیوەو نموونەی بۆ دەستنیشان نەکردووە.. بۆ نموونە:

بۆچی فەرموویەتی نەبیی ئەمین

(اطلبو العلم ولو بالصين)
نێر و مێ لەو حەدیسە فەرقی نییە
گەر مەلا نەهیی فەرموو، دینی نییە... حاجی قادری کۆیی

نیوە دێڕی دووەمی ئەو پارچەیە فەرموودەیێکی پێغەمبەرە (درود و سلاّوی خوای لەسەر) و بە زمانی عەرەبییە، شاعیر بە شیعرە کوردییەکەی خۆی تێکهەڵکێش و مولەممەع کردووە، بەوەی (مولەممەعی تێکهەڵکێشراو) بەرهەم هاتووە.

جوانی ئەم هونەرەش لەوەدایە: جگە لە سێ خاڵەکانی بۆ مولەممەعمان نووسی، ئەو خاڵەشی دێتە سەر: بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانە نەتەوەییەکە و شیعرە نەتەوەییەکەیە، بە بیر و واتای جوان و بەهێزی نەتەوەکانی تر.

## جۆرەکانی مولەممەعی تێکهەڵکێشکراو:

١ـ مولەممەعی تێکهەڵکێشراوی هاوسەنگ.. ئەو مولەممەعەیە، کە دوو زمان، یان زیاتری بە یەکسانی بەکارهێناوە، بۆ نموونە:

دەخیلت بم وەرە ساقی (أدر كأسا وناولها)
غەم و غوصەی دڵم کەمبوو (ولی أفتاد مشكلها)
ئومێدی میسکی موشکینم (صبا زان گره بگشايد)
کەچی نەمزانی بەم دەردە (چه خون أفتاد در دلها)
تا لە دوادێڕدا کە دێڕی حەوتەمە دەڵێت:
ئەگەر تۆ موخلیسی عیشقی (أز و غائب مشو حافظ)
کە حاجی بۆ سەفەر بڕوا (دع الدنيا وأمهلها)... حاجی قادری کۆیی

لەم شیعرەیدا حاجی بە یەکسانی هەموو نیوەدێڕەکانی مولەممەع کردووە، کوردییەکە هی خۆیەتی و فارسییەکە هی (حافزی شیرازی)یە، بەوەش مولەممەعی تێکهەڵکێشراوی هاوسەنگ بەرهەمهاتووە.

ـ لە ئافاقی فەخرا ئەبوومە قەمەر
أگر شاهرا شەهـ بودی پدر
ئەگەر دەیبوو زەڕڕە وەفاو و هونەر
بسر بر نهادی مرا تاج زر

ئەنیسی سولەیمانی دەبووم هودهودی
أگر مادری شاه بانو بدی
لە پێشا ئەگەر نەقشی پارەی دەدی
مرا سیم و زر تا بزان و بدی... حەمدی

ئەم پارچە شیعرە مولەممەعە بەشێکە لە هۆنراوەییێکی مولەممەعی تێکهەڵکێشکراوی کوردی و فارسی، پێکهاتووە لە (١٠) دێڕە شیعر، هەمیشە نیوەی یەکەمی دێڕەکان بە زمانی کوردییە و هی (حەمدی)یە، بەڵام نیوەی دووەمی دێڕەکان بە زمانی فارسییە و هی (فیردەوسی توسی)یە، بەوەش مولەممەعی تێکهەڵکێشکراوی هاوسەنگ دروست بووە، چونکە وەکو گوتمان هەردوو زمانەکە بە یەکسانی بەکارهێنراون.

٢ـ مولەممەعی تێکهەڵکێشراوی لاسەنگ:

ئەو مولەممەعەیە، کە دوو زمان، یان زیاتری بە یەکسانی بەکارنەهێناوە، بۆ نموونە:

ـ شێخ کە پۆلیسی دەوێ و عەسکەری سوارە و پیادە
بۆ هەموو فیتنەو و شۆڕش کە بووە ئامادە
دەستی هەڵگرت لە خوداو دینی کە کرد ئازادە
(أین همه از پی انست کە زر میخواهد)... حەمدی

ئەمە چوارینێکە لە هۆنراوەییێکی پێکهاتوو لە (٩) چوارین، هەمیشە سێ نیوە دێڕەکانی یەکەمی چوارینەکان هی (حەمدی) شاعیرن و بە زمانی کوردینە، نیوە دێڕی چوارەمیش هی شاعیرێکی فارسە، کە دیارە بە هاوسەنگی هەردوو زمانی کوردی و فارسی بەکارنەهێناوە، بەوەش مولەممەعی تێکهەڵکێشراوی لاسەنگ بەرهەم هاتووە.

## دوو سەروا:

لە رەوانبێژی عەرەبیدا (التشریع)ی پێدەڵێن.. ئەم هونەرە تایبەتە بە شیعر.. بریتییە لە بوونی دوو (سەروا)ی لەیەك کات بۆ هۆنراوەیەك.. کە دەشڵێین دوو (سەروا)ی لەیەك کات بۆ هۆنراوە، مەبەستمان ئەوەیە، ئەگەر بۆ نموونە ژمارەی بڕگەکانی دێڕە هۆنراوەیەك (١٣) بڕگەبێ، لە کۆتایی بڕگەی هەشتەمی دێڕەکە و هەتا کۆتایی هۆنراوەکەش لەو شوێنە بە

شێوەیەك هۆنراوەكە سەروادار بكرێت، كە ئەمە (سەروا)ی یەكەمی هۆنراوەكەیە.. ئینجا ئەو پێنج برگەیەش، كە لە هەر نیوە دێڕێك و تا كۆتایی هۆنراەكە دەمێنێ، دووبارە بە شێوەیەكی تر ئەوەش سەروادار بكرێت، ئەمەش سەروایەكی دووەمی هۆنراوەكەیە و بەو شێوە هۆنراوانە، كە ئاوا سەروادار دەكرێن، دەگوترێت هۆنراوەی (دوو سەروا)یی.. بۆ وێنە:

شیرین.. بەستەی گوڵاڵەی سوور — تریفەی مانگم
شیرین.. گەشەی ئەستێرەی دوور — گفت و گۆو بانگم
شیرین.. تیشكی ڕۆژی دەم كەل — بۆ وێرانەی دڵ
شیرین.. هاژە و جریوەی مەل — بۆ وەنەوشە و گوڵ... دیلان

لەو پارچەیەدا، دەبینین بەشی یەكەمی هۆنراوەكە:

ـ شیرین.. بەستەی گوڵاڵەی سوور
شیرین.. گەشەی ئەستێرەی دوور
شیرین.. تیشكی ڕۆژی دەم كەل
شیرین.. هاژەو جریوەی مەل

پێكهاتووە لە دوو دێڕە هۆنراوە، ژمارەی برگەكانی هەر نیوە دێڕێكیان هەشت برگەیە، سەروای دێڕی یەكەم (ر)و سەروای دێڕی دووەم (ل) دروستی دەكات.. بەشی دووەمی هۆنراوەكەش:

ـ تریفەی مانگم
گفت و گۆو بانگم
بۆ وێرانەی دڵ
بۆ وەنەوشەوگوڵ

پێكهاتووە لە دوو دێڕە هۆنراوە، سەروای دێڕی یەكەم (گ)و، سەروای دیری دووەم (ڵ) دروستی دەكات، ژمارەی برگەكانی هەر نیوە دێڕێكیشیان پێنج برگەیە.. ئینجا گەربێت و لە ڕووی واتاوەش بۆیان بڕوانین، كە دوو بەشەكە لێك دەكەینەوە، بەجیا چ بەشی یەكەم، چ بەشی دووەمیش دەتوانن واتای سەربەخۆش بدەن و ئەگەر بەسەر یەكەوەش نەبن، بێهوودە نەمێنن، كە ئەمەش مەرجێكی گرنگی (دوو سەروا)یە، دەبێت لە كاتی لێكجیاكردنەوەی هەردوو بەشەكان، هەریەكەیان بتوانن، بە تەنیا واتا ببەخشن.

### جۆرەكانی (دوو سەروا)

به گوێرەی پێكهاتە بڕگەییەكانی هەردوو بەشە سەرواداره‌كان، دەشێ (جووت سەروا) ئەم جۆرانەی خوارەوەی ببێ:

١- (دوو سەروا)ی (هەشت بە چواری).. لێرەدا سەروای بەشی یەکەم لە بڕگەی هەشتەم و سەروای بەشی دووەم لە بڕگەی دوانزەیەمی دێڕەكە دێت.. بۆ وێنە:

ـ چنگێكی ئاسنینی ڕەش　　ڕایكێشاوم
لەچوار دیواری قووچ و كەش　　خزێنراوم
ئەوەندەی كەڵلە بێژنێ　　ئاسمانی شین
چاوی وەك كونی سوژنێ　　پرقاڕ و قین
ئاراستەی نێو چەوانم و　　دوو چاومە
ڕێگری شیعرەكانم و　　هەنگاومە
ویڵم بەدووی پڕشنگێكا　　گەش و ئاڵە
بەدووی ئاوازی زەنگێكا　　زۆر زولاڵە... دیلان

بەشی یەكەمی ئەم پارچەیە، نیوە دێڕەكانی هەشت بڕگەیی و بەشی دووەمیشی نیوە دێڕەكانی چوار بڕگەیین.

٢- (دوو سەروا)ی (هەشت بە پێنجی) .. لێرەدا سەروای بەشی یەكەم لە بڕگەی هەشتەم و سەروای بەشی دووەم لە بڕگەی سێنزەیەمی دێڕەكە دێت.. بۆ وێنە:

ـ نەبریقەی شەونمی سەر　　چیمەنی قەراغ
نەخەندەكەی تازە غونچەی　　درەختانی باغ
نە كەروێشكەی دەغڵی بنار　　نە هاژەی چاوە
نە ئەو بۆنە سەرمەستكەرەی　　ئەگریچە خاوە... دیلان

بەشی یەكەمی ئەم پارچەیە، نیوە دێڕەكانی هەشت بڕگەیی و بەشی دووەمیشی نیوە دێڕەكانی پێنج بڕگەیین.

٣- (دوو سەروا)ی (دە بە پێنجی)، بۆ وێنە: .. لێرەدا سەروای بەشی یەكەم لە بڕگەی دەیەم و سەروای بەشی دووەم لە بڕگەی پانزەیەمی دێڕەكە دێت.. بۆ وێنە:

ـ ئەی مانگ بۆ لێلە تریفەت ئیمشەو    هەڵبزرِکاوە
چاوی کەژاڵت وەك چووبێتە خەو    سیس و ژاکاوە
بریقەی گۆنای درەوشەدارت    زەرد و خاکییە
شەوق و چریسکەی گەشی ڕووخسارت    کەم ڕووناکییە... دیلان

ئەم پارچەیە، نیوە دێڕەکانی بەشی یەکەمی (دە) بڕگەیی و، نیوە دێڕەکانی بەشی دووەمیشی پێنج بڕگەیین.

**دوو سەروای مولەممەع:**

ئەم هۆنراوەیە، کە لە رووی کێش و سەرواوە لەسەر دوو کێش و دوو سەروای لە یەك جیا دادەمەزرێت، لە رووی داڕشتنیشەوە بە زیاتر لە زمانێك دادەهێنرێت، بۆ نموونە:

غەم ئەنیسی رۆژ و شەومە من نەبم غەمبار ئەبێ
خۆی لە خۆی بێزار ئەبێ
تا کند ناشاد مارا مادرا سازیم شاد
درد ماگردد تچاد
فەقر و سەروەت بۆ بەشەر هەردوو گرفتاری نییە
میحنەتی جاری نییە
هر کرانبود تمنا بیشتر از اب و زاد
واقعا ازاد زاد
عاشق و تەدبیری یار و زاهید و تەزویری نار
ئەم بە ئیشی ئەو چ کار
نیك و بد این پیشەها اولادرا اجداد داد
داد از اجداد داد... حەمدی

ئەم هۆنراوەیە دەبینین لە لایەك لەسەر دوو کێش و دوو سەروای لێکجیا دامەزراوە، کێشی هۆنراوەکە کێشی (ڕەمەل)ی عەروزییە، سەرواکەیش بە پیتی (د) دروستکراوە، ئەگەر ئەم دوو کێش و سەروایە لێك بکەینەوە، دەبێتە دوو شیعری نوێ و وەهایان لێدێت:

شیعری یەکەم:

غەم ئەنیسی رۆژ و شەومە من نەبم غەمبار ئەبێ

تا کند ناشاد مارا مادرا سازیم شاد

فەقر و سەروەت بۆ بەشەر هەردوو گرفتاری نییە

هر کرانبود تمنا بیشتر از اب و زاد

عاشق و تەدبیری یار و زاهید و تەزویری نار

نیك و بد این پیشەها اولادرا اجداد داد

کێشی ئەم پارچەیە بریتییە لە (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلا)

شیعری دووەم:

خۆی لە خۆی بێزار ئەبێ

درد ماگردد تچاد

میحنەتی جاری نییە

واقعا ازاد زاد

ئەم بە ئیشی ئەو چ کار

داد از اجداد داد... حەمدی

کێشی ئەم کەرتەش بریتییە لە (فاعلاتن فاعلا)

لە لاییێکی دیکەوە دەبینین ئەم شیعرە بە دوو زمانی کوردی و فارسیش نووسراوە، بەوەش مولەممەعێکی دوویی بەرهەمهێناوە، بۆیە دوسەروای مولەممەعی هونەرێکی لێکدراوە.

## سەرواداری متەوازن:

ئەمە (موازنة) و (مماثلة) و (التسجیع المتوازن)یشی پێدەگوترێت.. جۆرێکە لە سەروادار، لەسەر ئەوە دادەمەزرێ، کە: دوو وشەکانی کۆتایی لەتەدێڕەکان هاوشێوە بن و تەنیا لە پیتی دواییینیان لێك جیابن، دیارە مەبەست لە هاوشێوەیی، ئەوەیە ئەو وشانە لە رووی مۆسیقییەوە وەکو یەك بکەونە بەرگوێ، بۆیە پێناسەکەی قەزوینی ئەمە روونتر دەکاتەوە، کە دەڵێت: بریتییە لەوەی دوو وشەکانی کۆتایی لەت، هاوکێش بن، بەڵام هاوسەروا نەبن، ئەمەش ئەوە دەردەخات، کەواتە متەوازن: بریتییە لە یەکسانی دوو وشەکانی کۆتایی لەتەدێڕ بێ ئەوەی لە سەرواشدا یەکسان بن.. بۆ نموونە:

ـ بۆ باغی مەردی باغی سەرمایەکەی خەزانی

بۆ مەزرەعەی فەقیران سەرمایەکەی بەهاری... حاجی قادری کۆیی

کۆتایی لەتی یەکەم بە (خەزان) و کۆتایی لەتی دووەم بە (بەهار) هاتووە، ئەم دوو وشەیە هاوکێشن، بەڵام لە سەروادا لێکجیاوازن، ئەوەش (متەوازن)ی پێ دەڵێن.

ـ هیجرەتە حەمدی عیلاجی دەردی هەمسایەی خراپ

ئەمسەر و ئەو سەر خەریکی گەستنی لێوە ددان... حەمدی

کۆتایی لەتی یەکەم بە (خراپ) و کۆتایی لەتی دووەم بە (ددان) هاتووە، ئەم دوو وشەیە هاوکێشن، بەڵام لە سەروادا لێکجیاوازن، ئەوەش (متەوازن)ە.

## سەرواداری متەوازی:

لە (التسجیع المتوازی)ی عەرەبی وەرگیراوە.. جۆرێکە لە سەروادار، ئەوەیە، کە: وشە کۆتاییەکانی رستە، یان لەتەدێڕ هاوکێش و هاوسەروا بن.. واتا متەوازی ئەوەیە: وشە کۆتاییەکانی رستە، یان لەتەدێڕ پیتەکانیان بە قەد یەکبن، یا زۆربەشیان، یان هەندێکیشیان لێك جیاواز بن، بەڵام لەسەر یەك کێش بن و یەك سەرواشیان هەبێ.. بۆ نموونە:

ـ چە فەرقێکە لە مابەیندا بوخاری، یانە گەیلانی

کە مەیلت بۆ عیبادەت بێ، چە تەحتانی چە فەوقانی... مەلا عوسمان

وشەکانی (گەیلانی) و (فەوقانی) کە کەوتوونەتە کۆتایی هەردوو لەتەدێڕەکانی یەکەم و دووەمی ئەم دێڕەی سەروو، هەردووکیان هاوکێش و هاوسەروان، بەوەش سەرواداری متەوازی دروستبووە.

## سەرواداری موتریف

لە (سجع المطرف)ی عەرەبی وەرگیراوە.. جۆرێکە لە سەروادار، ئەوەیە کە وشە کۆتاییەکانی رستە، یان لەتەدێڕ هاوکێش نەبن، بەڵام هاوسەروا بن.. بۆ نموونە:

ـ داغی کردم بە جەفا لالە ڕوخێ زیبایێ

پیری کردم بە ستەم لا مەزەبێ تەرسایێ

تیێژ بین وەقتی ستەم گاهی کەرەم بێ بەصەرێ

لە وەفا هیچ نەزانیٚ لە جەفا دانایێ
یاری ئەغیار و بە خۆی موئمین و کافر سیفەتیٚ
خزمی دوشمن ڕەووش و قاتیلی بیٚ پەروایێ... حاجی قادری کۆیی
وشەکانی (تەرسا) و (دانا) و (پەروا) هەر سیٚکیان بە پیتی (ا) کۆتا هیٚنراون، (ا) پیتی ڕەوییە، کەواتە هاوسەروانە، بەلاٚم هاوکیٚش نینە، ئەوەش (سەرواداری موتریف)ی پیٚدەگوتریٚت.

ـ بولبولیٚکم دی بە خەمناکی لە خاك دەخولایەوە
خویٚن لە زامی جەرگی هەردەم تاك و جووت دەتکایەوە... خاکی
وشەکانی (دەخولایەوە) و (دەتکایەوە) هەر دووکیان بە پیتەکانی (ایەوە) کۆتا هیٚنراون، (ا) پیتی ڕەوییە، (یەوە) پاش ڕەوییە، کەواتە هاوسەروانە، بەلاٚم هاوکیٚش نینە، ئەوەش (سەرواداری موتریف)ی پیٚدەگوتریٚت.
ـ ئەی خۆش خەبەر نەسیمی سەحەر پەیکی عاشقان
ئەی قاصیدی نیازی هەر ئاوارە وا وەرە
دیدەم ببینە هەر وەکو دوو چاوە پڕ لە خویٚن
سینەم ببینە هەروەکو کورەی پڕ ئاورە
گەر ئاوی سەیلی دیدە نەبیٚ سینە سووتووە
گەر تاو و جۆشی سینە نەبیٚ دیدە موزتەرە
سوتاوی تاوی سینەم و غەرق و ئاوی چاو
لوتفیٚ بفەرموو چارەییٚ لەو ئاو و ئاورە
وەك نەهری چاو و مەشعەلەیی دلٚ بڕۆ بە تاو
بۆ و دولبەرە کە گولٚبەرە پەیغامی دلٚ بەرە... وەفایی
وشەکانی (وەرە)، (ئاورە)، (موزتەرە)، (ئاورە)، (دلٚ بەرە) هەر پیٚنجیان بە پیتەکانی (رە) کۆتا هیٚنراون، (ر) پیتی ڕەوییە، (ە) پاش ڕەوییە، کەواتە هاوسەروانە، بەلاٚم وەکو تەماشا دەکەین هاوکیٚش نینە، ئەوەش (سەرواداری موتریف)ی پیٚدەگوتریٚت.

# بەشی دووەم

# جوانکاری واتایی

### دەستپێکی دڵگیر:

ئەمە لە عەرەبیدا (براعة المطلع) و (براعة الأستهلال)یشی پێدەگوترێت.. یەکێکە لە گرنگترین هونەرەکانی جوانکاری (البدیع)، بریتییە لەوەی: شاعیر لە نیوە دێڕی یەکەمی دێڕەکەی (سەدرِی دێڕەکەی) بە گوتەیەکی ناسك و ئاسان دەست پێبکات، کە هیچ زۆر لەخۆکرنێکی تێدا نەبێت و لە رووی واتاوە روون و ئاشکرابێ، لە دێڕەکانی دوای خۆی سەربەخۆ بێت، بەڵام بە ئاماژە، نەك بە راستەوخۆیی مەبەستی شاعیر لە تەواوی هۆنراوەکەی لە خۆ بگرێت، وشەکانی گونجاو بن لەگەڵ ئەو بابەتەی گوزارشتی لێ دەکەن، واتە: ئەگەر بابەتە گوزارشتلێکەرەکەی حەماسی بوو، ئەویش وشەکانی قەبە و توند و پڕ لە حەماسەت بن و بەرانبەر بخەنە جۆش و خرۆش، ئەگەر بابەتەکەشی سۆزاوی بوو، وشەکانیشی ناسك و سادە و سۆزجولێن بن.

بە کورتی: دەستپێکی دڵگیر ئەوەیە یەکەم دێڕی هۆنراوە، بە هۆیێك لە هۆیەکان زەینی خوێنەر بۆ ئەوە ببات، کە هۆنراوەکە باسی دەکات، دەبێ وشەکانی ناسك و دەربڕینەکانی جوان و بیری روون و واتای بەهێز بێت.. بۆ نموونە:

ـ ئەی حەددی کبرییات، وەڕای فەهمی ماسیوا
وەی حەصری ئیعتیلات لە وەهمی مە ماوەڕا... ئەدەب

ئەمە دێڕی سەرەتای هۆنراوەیەکی (میصباحول دیوان ـ ئەدەب ـ )ە، کە تایبەتی کردووە بۆ ستایش و سەناکردنی خودای گەورە، وشەکانی دێڕەکە هەمووی وشەو دەستەواژەکانی قەبە و سەنگین و پڕ لە واتاو رێزێکی تایبەتن، (حەددی کبریات) و (وەڕای فەهمی ماسیوا)، (ئیعتیلات)، هەموو تایبەت و پڕ واتاو بە نرخن، شیاون بۆ ستایشی خوای گەورە بەکاربهێنرێن، واتە: ئەی ئەو زاتەی ئاستی شکۆداری و مەزنایەتیت لە سەرووی تێگەیشتنی ئێمە و مانانەوەیە، ئەوەی بچووکی وەکو ئێمە لە بارەی تۆی بەرز و پایەبڵند و شکۆدار بۆی دەچێت، زۆر بچووکترە لەوەی تۆ هەیت و شیاوی باشتر بتناسین.

ئەم دێڕەدا ئاشکرا و ڕاستەوخۆ تیشك نەخراوەتە سەر ئەوەی هۆنراوەکەی باسی خوای گەورە و تاك و تەنیای بەتوانا دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەیەك هەیە، کە بابەتی هۆنراوەکە زاتی عەزیم و گەورەی خوای بە دەسەڵاتە، بە گشتی دێڕەکە هەموو مەرجێکی دەستپێکی دڵگیر (براعە الّستهلال)ی تێدایە.

ـ یەك لەمعەیی ئەنوارە سەراپایی پەیەمبەر
ئەمسالّی بە سایەش نییە ئەعزایی پەیەمبەر... حەمدی
ئەم دێڕە دەستپێکی هۆنراوەییێکی جوانی (حەمدی)یە لەسەر پێغەمبەر (درود و سلاّوی خوای لەسەر)، هۆنراوەییێك کە سەرەتای بە وەسفی پێغەمبەر دەست پێبکات (درود و سلاّوی خوای لەسەر)، دیارە زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێ، کە بە یەك دێڕ لەسەری بنووسرێ، بۆیە ئەوە ئاماژەیە، کە هۆنراوەکە باس لە چی دەکات. شێوازی ئەم دێڕە بەهێزە، وشەکانی جوان و کاریگەرن، واتاکەی روون و بەهێزە، بەوەش (دەستپێکی دڵگیر) بەرهەم هاتووە.

ـ تا فەلەك دەورەی نەدا، سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو
کەوکەبی میهری موبارەك تەڵعەتی پەیدا نەبوو... نالی
ئەمە دێڕی سەرەتای هۆنراوەیەکی (نالی)یە، بە بۆنەی کۆچی دوایی سلێمان پاشای بابان و هاتنە سەرتەختی ئەحمەد پاشای بابانی کوڕیەتی، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ چ پەیوەندی بە دێڕەکانی دوای خۆیەوەی نییە و بە خوێندنەوەی تەنها ئەو دێڕە، کەس لەوە ناگات کە دەبێت لە پاشتر شاعیر چی بڵێت، چونکە بە ئاشکرا باسی لە فەلەك و سووڕانەوەی کەشکەلانی فەلەك و ئاوابوونی ئەستێرە و مانگەکانی دەکات، بەڵام ئەمە بە ئاماژە ئەوە لە خۆیدا هەڵدەگرێت، کە تا مانگێکی زۆر روون و گەش بەسەر نەچێت، کە سلێمان پاشایە، مانگێکی هاوشێوەی ئەوەی پێشوو گەش، کە ئەحمەد پاشایە دەرناکەوێت. دەبینین دێڕەکە هیچ زۆر لەخۆکردنێکی تێدا نییە و وشەکانی جوان و ناسك و پڕ سۆزن و هەموو مەرجێکی دەستپێکی دڵگیر (براعة الأستهلال)ی تێدایە.

ـ گوتم بە بەختی خەواڵوو: بەسە ئەتوو بی خودا
لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا... حاجی قادری کۆیی

ئەم دێرە هی سەرەتای هۆنراوە بەناوبانگەکەی (حاجی قادری کۆیی)یە، دوای بێزاربوونی شاعیر لە دووره ولاّتی هۆنراوەتەوە، ئاماژەیەکی تێدایە، کە گوزارشت لە ئەولا دەکات، کە ناوەوەی ولاّت و (کۆیە)ی زێدی خۆیەتی، بابەتەکە سۆزئامێزە و وشەکانیش کرۆزانەوەیەکی ناسك و جوان لەخۆ دەگرن، کە شاعیر دێت لەبەر نەفسی خۆی دەلاّلێتەوەو دەیداتە خوا، بۆ ئەوەی دڵی نەشکێنێت و لەگەڵیدا رێککەوێت، گەشتێکی خەیاڵی بەرەو کۆنەهەوارەکەی بکەن. بە کورتی دێرێکە هەموو مەرجێکی دەستپێکی دڵگیر (براعة الأستهلال)ی تێدایە.

ـ بە بیرم دێ سلێمانی کە دارولمولکی بابان بوو

نە مەحکومی عەجەم نە سوغرەکێشی ئالی عوسمان بوو... شێخ رەزای تالەبانی

ئەمە یەکەم دێری هۆنراوە بەناوبانگەکەی (شێخ رەزای تالّەبانی)یە، کە تیایدا بۆ رۆژانی سلێمانی سایەی بابان دەگەڕێتەوە، هەردوو نیوە دێرەکانی یەکەم و دووەم لە رووی واتاوە تەواوکەری یەکن و لە یەك ئاستی بەهێزدا هاتوون، دەستەواژەی (دارولمولکی بابان) بۆ (سلێمانی) بەکارهێنراوە، کە مەبەست لە باسکردنی سلێمانی ئەوسا دەرخستنی پایە سەربەخۆ و دڵگیرەکەیەتی، بۆیە دەستەواژەی ئاماژەبۆکراو زۆر بە جوانی لەگەڵ مەبەستی ئەو بابەتەدا یەکدەکەوێت، کە شیعرەکەی بۆ هۆنراوەتەوە. هەموو مەرجێکی دەستپێکی دڵگیر (براعة الأستهلال)ی تێدایە.

**کۆتایی دلگیر:**

عەرەب (براعة المقطع)ی پێدەڵێن.. جۆرێکە لە (کۆتایی جوان)، بەلاّم شتێکی لەو زیاترە، بریتییە لەو دوا بەشەی ئاخاوتن، کە بە هۆیەك لە هۆیەکان وا دەکات، هەست بەوە بکرێ، کە ئەمە کۆتاییە.. جوانی ئەم هونەرەی (کۆتایی دڵگیر)یش لە چەند شتێك دایە، دەتوانین لەم خالاّنەی خوارەوەیان کورتبکەینەوە:

١ـ چێژی ئەدەبی خۆش دەبەخشێت.

٢ـ ئامۆژگارییەکی هێندە بەهێز پێشکەش دەکات، هەمیشە هەر لە بیر دەمێنێتەوە.

٣ـ وشەکانی مۆسیقی و خاوەن کێشێکی خۆشن و لە بیردا دەمێننەوە.

**شێوەکانی دەرکەوتنی کۆتایی دڵگیر:**

١ـ دەشێ شاعیر تۆمەت بداتە پاڵ قەڵەم، بەوەی کەوا توانای نووسینی نەماوە، چونکە شکاوە، یان مەرەکەبی تیانەماوە، کە ئەمە یەکێکە لە شێوازە بەهێزەکانی شیعری کلاسیکی کوردی، شاعیر کە پەنا دەباتە بەر ئەم شێوازە، ئیتر ناڵێت هۆنراوەکەم تەواو بوو و بە خواتان دەسپێرم، یان وەکو حەکایەت گێڕانەوە ناڵێت، (منیش کڵاشم دڕاو چیم پێ نەبڕا)! بەڵکو بە شێوازێکی هونەری جوان و دڵگیر دەڵێت: (خامەکەم نووکی شکا)، یان (خامەکەم مەرەکەبی نەما)، بەم شێوەیە خوێنەر لەوە حاڵی دەکات، کە هۆنراوەکەی گەیشتە کۆتایی، دیارە ئەوە لە هەمانکاتیشدا خۆدزینەوەییێکی جوانە لە چیتر درێژکردنەوە، شاعیریش بەهێزەوە پیشان دەدات، چونکە گوایە قسە و باس و فیکر و داهێنانی دیکەی مابوو، لەبەر نەمانی ئەوانە نییە هۆنراوەکەی بە کۆتا دێنێ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە قەڵەمەکەی چیتر نانووسێ، یان بە هۆییێکی تر پەکی کەوتووە.. بۆ نموونە:

ـ گەلێ قسەم لە دڵا بوو حیکایەتم مابوو

کەچی لە بەختی کەچم، خامە نووکی لێرە شکا... حاجی قادری کۆیی

(خامە نووکی لێرە شکا) ئاماژەیە بەوەی کەوا ئیتر بەمە هۆنراوەکە هاتە کۆتایی. وشەکانی ئەم دێڕەش هەموویان روون و ئاشکران و واتای جوان و تەواو دەگەینن، شێوازەکەش وەکو گوتمان شێوازێکی جوان و بەهێزە، بۆیە ئەمە بە یەك لە کۆتاییە دڵگیرەکانی حاجی قادری کۆیی دادەنرێت.

(حەمدی)ش سەر بە هەمان قوتابخانەی کلاسیکە، بۆیە ئەویش سوود لە هەمان شێوازی کلاسیك وەردەگرێت، ئەوەتا دەڵێت:

ـ زەمانی خامە مووی لێ دێ، لە باسی زولفی جانانە

بە دەست حەمدی نییە چ بکەم، کە نانووسێ قەڵەم گەر خەت... حەمدی

کەوابێ تۆمەت دانە پاڵ خامە بە نەمانی توانای نووسینی، ئەوە یەکێکە لەو هۆیانەی زەینی خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە شیعرەکەی گەیشتە کۆتایی.

٢ـ جگە لەوەی سەروو، هەندێ جاری دیکە شاعیر روو دەکاتە خۆی و داوای وازهێنان لە خۆی دەکات، بەوەش دیسانەوە سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە شیعرەکەی لێرەدا ئیتر بە کۆتا دەگات.. بۆ نموونە:

ـ ئەدیب و عاقڵی، لەم بەحرە وەك ترِی بن گۆم

گەلێکی ون بووە (حاجی)، وەچاکە لێی دەرچین... حاجی قادری کۆیی

شاعیر لێرەدا ئەوەی خستۆتەڕوو، کە ئەم باسەی کردوویەتیانەوە باسێکی ئاوکێشەو زۆر کەس تیای دەرنەچووە، بۆیە داوای لە خۆی کردووە، کە ئەویش وازبێنێ و چیتر درێژی نەکاتەوە، ئەوەش هۆکارێکی دیکەی جوانە بۆ سەرنجڕاکێشانی خوێنەر بەوەی کەوا شیعرەکەی گەیشتە کۆتایی، لەولاشەوە وشەکانی ئەم دێڕە شیرین و واتا روون و بەهێزن و شێوازی دێڕەکە کاریگەری جوانی هەیە، هەموو ئەوەش دەیبەنە خانەی کۆتایی دڵگیر.

**دژیەك:**

یەکێکە لە هونەرەکانی جوانکاری واتایی، لای عەرەبکان بە زاراوەکانی (الطباق والمطابقة، والتطبیق والتضاد والتکافوء) ناودەبرێت، بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو وشە، کە ئەو وشانە لە رووی واتاوە دژ و پێچەوانەی یەك بن، بۆ نموونە: رەش و سپی، پاك و پیس، جوان و ناشـرین، گەورە و گچکە، پاك و ناپاك...هتد. بۆ نموونە:

ـ عەکسی چاوی تۆ لە چاوی دا بە خواری تێدەگەی

کەچ نەزەر کەی فەرقی خوار و ژوور و خێر و شەڕ دەکا... نالی

خوار و ژوور و خێر و شەڕ دوو جووتە وشەی دژو پێچـەوانەی یـەکن و هـەر یەکـەیان لـە فەرهەنگدا رەگی سەربەخۆیان هەیە، بەوەش دژیەکی دروستبووە.

ـ لە ئەزەل تا ئەبەد خوا خوایە

جیلوەییێکە کە پڕ دوو دنیایە... حەمدی

وشەکانی (ئەزەل) و (ئەبەد) دوو وشەی دژو پێچـەوانەی یـەکن، یەکـەمیان بریتییـە لـە رابردووی بێ سەرەتا و دووەمیان بریتییە لە داهاتووی بێ کۆتایی. کـە ئەمانـە هـەردووکیان سیفەتی خودای گەورەو میهرەبانن.

ـ لابدا هەر کەس لە رێگەی شەرع و دین

قوڕ بەسەر خۆی پاشی مردن رۆژی ژین... رەشاد موفتی

وشەکانی (مردن) و (ژین) دوو وشەنە دژو پێچەوانەی یەکترین و هەر یەکەیان لە فەرهەنگدا رەگی سەربەخۆیان هەیە، بەوەش دژیەکی دروستبووە.

ـ هەر پایەداران ناویان زیندووە
پیاوی بیٚ کەڵك پەست و مردووە... بێکەس
وشەکانی (زیندووە) و (مردووە) دوو وشەنە دژ و پێچەوانەی یەکترین و هەر یەکەیان لە فەرهەنگدا رەگی سەربەخۆیان هەیە، بەوەش دژیەکی دروستبووە.
گرنگی دژیەك لەوەدایە: لەلایەك جوانییەك بە دەربڕین دەبەخشێت، لەولاوەش لە واتای دەق فراوانتر دەکات، کاتێك کە دەڵێیت (دەر و ژوور)، (شەو و ڕۆژ)، (پاك و پیس) گەڕاوم، یان بینیومە، یان هەر شتێکی تر، واتە هیچت نەهێشتۆتەوە لە رووی ئەو فرمانەی بەکارت هێناوە تاقیت نەکردبێتەوەو سوودت لیٚ وەرنەگرتبێت، هەر ئەمە وا دەکات مەبەستەکانی قسەکەر روونتریش بێت، لەوەی تەنیا یەك لایەنی دوو وشە دژیەکەکە بەکاربهێنێت، لەبەر هەموو ئەوانە لە کۆنەوە ئەدەب گرنگی زۆری بەو هونەرە داوەو دەکریٚ بڵێین: ئەدیب نییە لە دەربڕینەکانی دژیەك بەکارنەهێنیٚ.

## جۆرەکانی دژیەك:

بە پێی جۆری ئەو وشانەی دژیەکەکە دروست دەکەن، دوو جۆر دژیەکی لەیەك جودا هەیە، ئەوانیش بریتینە لە:

## یەکەم: دژیەکی فەرهەنگی

دژیەکی فەرهەنگی: لە عەرەبیدا (تیباقی ئیجاب)ی پێدەڵێن.. بریتییە لە بوونی دوو وشەی هەر لەبنجدا دژ و پێچەوانە بە واتای یەکتری، هەر وەك (باش و خراپ)، (پاك و پیس)، یان بە واتایەکی تر، لەم جۆرە دژیەکەدا، دوو وشەکانی (دژیەك) لە فەرهەنگدا دوو سەرچاوەی لەیەکجیایان هەیە و پەیوەندی نێوانیان، پەیوەندییەکی سروشتییە، نەك پەیوەندییەکی دروستکراو.. بۆ وێنە:
ـ بە ڕوئیەتی ماهی مونیر، شاهی بەشیر و هەم نەزیر
تۆی صاحیبی فەزڵی کەبیر، ڕوویی تۆ شەمسی ئەزهەرە... شێخ ئەحمەدی کۆر
(بەشیر) و (نەزیر) دوو وشەی خاوەن دوو رەگی تایبەت و سەربەخۆن لە فەرهەنگدا، هەردووکیان ئاوەڵناوی سادەن، دژیەکی فەرهەنگییان دروست کردووە.

- غەیری تۆ کێ قادرە بڕوا دەمێ لەم ڕێگەوە
یەعنی ئیزهاڕی کەلامی تاڵ و شیرین پێکەوە... ناری
(تاڵ) و (شیرین) دوو وشـەی خـاوەن دوو ڕەگـی تایبـەت و سـەربەخۆن لـە فەرهەنگـدا، هەردووکیان ئاوەڵناوی سادەن، دژیەکی فەرهەنگییان دروست کردووە.

- وان لە گێژی بەحری جەهلا وەرنەدەی ئەی گەنجەکان
عیلمە پاپۆڕی نەجاتتان تێبکۆشن ڕۆڵەگیان... عاصی
(جەهل) و (عیلم) دوو وشەی خـاوەن دوو ڕەگـی تایبـەت و سـەربەخۆن لـە فەرهەنگـدا، هەردووکیان ئاوەڵناوی سادەن، دژیەکی فەرهەنگییان دروست کردووە.

- داخۆم خاوەنی بەرزی و نشێوی
لە کارخانەی غەیب چی بۆ نووسیوی...ئەحمەدی موفتی زادە
(بەرزی) و (نشێوی) دوو وشەی خاوەن دوو ڕەگی تایبـەت و سـەربەخۆن لـە فەرهەنگـدا، هەردووکیان ئاوەڵناوی سادەن، دژیەکی فەرهەنگییان دروست کردووە.

- جارێك کەم و زۆر غەدرت لێکرا
بە تورە و گرژی مەیکە بە هەرا
هێمن لەسەرخۆ بکەن گفتوگۆ
هێندەی پێناچێ دەبنەوە برا... برژاو
(کەم) و (زۆر) دوو وشەن دژ و پێچەوانەی یـەکن، لـە فەرهەنگـدا هـەر یەکـەو ریشـەی سەربەخۆیان هەیە، بۆیە دژیەکی فەرهەنگی دروست دەکەن.

- بە پارە و پوولی زۆرت مەنازە
چەند جار گۆڕاوە لە کۆن و تازە
ئەوەی پەسند و ئاواتەخوازە
کردەوەی چاکە، جێگەی شانازە... برژاو

(کۆن) و (تازە) دوو وشەن دژو پێچەوانەی یەکن، لە فەرهەنگدا هەر یەکەو ریشەی سەربەخۆیان هەیە، بۆیە دژیەکی فەرهەنگی دروست دەکەن.



**ـ جۆرەکانی دژیەکی فەرهەنگی**

یەك: دەشێ دوو وشە دژیەکەکان، دوو (ناو) بن، بۆ وێنە:

ـ بەگەرمای هاوین، بەسەرمای زستان

تێری و برسییەتی لەلام بوون یەکسان... حیلمی

لە نیوە دێڕی دووەمدا وشەکانی (تێری و برسییەتی) دوو ناوی واتایین، (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

ـ ئەمن بۆ فیرقەتی ئەو ڕۆژ و شەو دائیم دەناڵێنم

لە دووری من هەمیشە ئەو کە خۆش خەندان و مەسرورە... کوردی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا وشەکانی (ڕۆژ و شەو) دوو ناوی بەرجەستەن، (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

جاری وایە شاعیر دوو ناو دێنێ، یەکیان کوردیەو یەکیان عەرەبی، واتە هەریەکەی بە زمانێکن.. بۆ نموونە:

ـ ئوممەتی تۆ شادوومانن، چونکە ئەهلی وەحدەتن

قەت لە دۆزەخدا ئەبەد نین، ئاخیری هەر جەننەتین... حەیدەری

(دۆزەخ) و (جەننەت) دوو وشەی خاوەن دوو ڕەگی تایبەت و سەربەخۆن لە فەرهەنگدا، هەردووکیان ئاوەڵناوی سادەن، دژیەکی فەرهەنگییان دروست کردووە.

دوو: دەشێ وشە دژیەکەکان دوو (ئاوەڵناو) بن... بۆ وێنە:

ـ فرسەتە تۆبەی بکەن بە گیان و دڵ

توندە ڕشتەی دینتان مەیکەن بە شل... ڕەشاد موفتی

(توند) و (شل) دوو ئاوەڵناوی چۆنین، لە بنجدا دژو پێچەوانەی یەکترین و لە فەرهەنگدا هەریەکەو کەسایەتییەکی سەربەخۆیان هەیە.

ـ دەوڵەمەند و ئەهلی دنیا قەت مەکەن فکری غرور

وا ئەجەل کەوتۆتە شوێنتان دائیمەن نێزیك و دوور... عاصی

(نێزیك) و (دوور) دوو وشەی خاوەن دوو رەگی تایبەت و سەربەخۆن لە فەرهەنگدا، هەردووکیان ئاوەڵناوی سادەن، دژیەکی فەرهەنگییان دروست کردووە.

سێ: دەشێ وشە دژیەکەکان دوو (ئاوەڵفرمان) بن... بۆ وێنە:

ــ صاعیقەو بەرقی نحوسەت زولّمەتی دا شەرق و غەرب

بەردە بارانە بە مەخصوصی لەسەر موڵکی بەبان... سالم

(شەرق و غەرب) لە نیوە دێڕی یەکەمدا دوو ئاوەڵفرمانی شوێنن، (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

ـ کوردی ئامان سەد ئامانت بێ کە ئەمشەو جومعەیە

تا سبەی قەت نەبییە غافل تۆ لە زیکری قادری... کوردی

(ئەمشەو و سبەی) لە نیوە دێڕی یەکەم و دووەمدا دوو ئاوەڵفرمانی شوێنن، (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

چوار: دەشێ وشە دژیەکەکان دوو (فرمان) بن، بۆ وێنە:

ـ هەور ئەگری بۆ گوڵ، گوڵ پێئەکەنی

باوك و فرزەندەی بێ ڕەحم دەنوێنی... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی یەکەمدا: وشەکانی (ئەگری) و (پێئەکەنی) دوو فرمانی رانەبردووی ئیخبارین و (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

پێنج: دەشێ وشە دژیەکەکان دوو (چاوگ)بن، بۆ وێنە:

ـ لەزەتی مردن بە سەد ساڵی ژیان ناگۆڕمەوە

گەر بزانم، تۆ لەگەڵما دێیە سەر قەبرانەکەم... شێخ نووری.

وشەکانی (مردن و ژیان) لە نیوە دێڕی یەکەمدا، دوو (چاوگ)ن و لە واتادا (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

ئەمەش: یان وادەبێ هەردوو دژیەکەکان (پیتی مانا) دەبن، بۆ وێنە:
ـ گوتم: زووکە درەنگە کاتی فرمانە، گوتی: (نا)
گوتم: بۆچی، خەبات ناکەی؟! گوتی: (با)... باوکی ئازیز
(نا) و (با) کە دو (پیتی مانا)ن هەردووکیان (دژیەکی فەرهەنگی)ن.

حەوت: دەشێ دوو وشەکان یەکیان ناو و ئەوی دووەم ئاوەڵناو بێ.. بۆ نموونە:
ـ لێم حەرامە دانەو و ئاوی حەماماتی حەرەم
من کە بازی دیدە بازم نەك شەوارەی دەستەمۆم... نالی
(دیدەباز) ئاوەڵناوی چۆنی و (شەوارە) ناوە و دژیەکی فەرهەنگین.

هەشت: دەشێ رستەیەك و گرێیەك وێنەیەکی دژیەکی دروست بکەن.. بۆ وێنە:
لە کن من با وجودی ناس و ئەجناس
کەسی تێدا نییە ئەم شارە بێ تۆ... نالی
(با وجودی ناس و ئەجناس) واتە، پڕی خەڵك و (کەسی تێدا نییە ئەم شارە بێ تۆ) واتـە، خاڵیبوونی شار لە کەس، ئەمەش دوو وێنەی دژو پێچەوانەی یەکە.

## دووەم: دژیەکی نافەرهەنگی

ئەمە لە عەرەبیدا (طباق السلب)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە بوونی ئەو دوو وشە بە یەك دژ و پێچەوانانەی، کە لە فەرهەنگی زماندا هەریەکەیان ریشەو بنجێکی رەسەن و سەربەخۆی نییە، بەڵکو هەردووکیان لە بنجدا هەر یەك ریشەو رەگیان هەیە، بەڵام وشەی دووەم لەسەر بنەمای دژایەتی و پێچەوانەیی بۆ وشەی یەکەم دروست دەبێت، بە واتا: وشەی دووەم هەمیشە دەبێتە نەرێی وشەی یەکەم.. بۆ نموونە: (هات) و (نەهات).. دەبینین هەریەکە لەم دوو وشانە لە فەرهەنگدا لە ریشەیەکی سەربەخۆ و خاوەن کەسایەتی تایبەتی خۆیانەوە سەرچاوەیان نەگرتووە، بەڵکو وشەی دووەم، کە (نەهات)ە، نەرێی وشەی (هات)ەو هەر لەسەر بنەمای ئەو دروستبووە، بەڵام بە چەمکی پێچەوانەیی، بۆیە بەجۆرە دژیەکە دەگوترێت: (دژیەکی نافەرهەنگی).. بۆ نموونە:

- محەممەد بوو بە غەیری وی نەبوو کەس بچتە سەر سیدرە
درودی خوا لەسەر ئیسم و موسەممایی محەممەد بی... رەشاد موفتی
(بوو) و (نەبوو) دژیەکی نافەرهەنگین، چونکە دووەم لەسەر بنەمای ئەوەی یەکەم بووەتەوە نەرێ و پێچەوانەی.

- دیدە نابینایە وەك یەعقوب لە هیجرانی عەزیز
تۆی خودای صاحیب مەکان و تۆی خودایی لا مەکان... سالم
(مەکان) و (لا مەکان) دژیەکی نافەرهەنگین، چونکە دووەم لەسەر بنەمای ئەوەی یەکەم بووەتەوە نەرێ و پێچەوانەی.

- من لە بێ بەرگی مەحەم پرسی کە بۆچ ڕووتی؟ وتی
ڕەببی من شێت بم ئەگەر شادبم بە بەرگی عارییە... نالی
(بێ بەرگ) و (بە بەرگ) دژیەکی نافەرهەنگین، چونکە دووەم لەسەر بنەمای ئەوەی یەکەم بووەتەوە ئەرێ و پێچەوانەی.

- ئەگەرچی یاوەر و یاوەر بوون بە دوژمن
خەمی بێ یاوەری یاوەرە ئەمشەو... کوردی
(بێ یاوەری) و (یاوەر)ی دژیەکی نافەرهەنگین، چونکە یەکەم لەسەر بنەمای ئەوەی یەکەم بووەتە نەرێ و پێچەوانەی.

- دارا لە نەدارا بووەتە کێوی زلەو بەرز
وا دوورە پەرێز ملکەچ ئەکا بۆ سەلەم و قەرز... چروستانی
(دارا) و (نەدارا)ی دژیەکی نافەرهەنگین، چونکە یەکەم لەسەر بنەمای ئەوەی یەکەم بووەتە نەرێ و پێچەوانەی.

جوانی دژیەکی نافەرهەنگی لەوەدایە، کە لە ناوەڕاستی ئەگەر و بارە گشتی و تایبەتییەکاندا بارێکی ناوەند هەڵدەبژێرێ و لەوێوە مەبەست پێشکەش دەکات، بۆ نموونە لە

قسەی سەر زاریدا زۆرجار دەگوتریّت: (پیاوەکە ئیسرحاتەکی کرد و نەکرد...)، (ژنەکە مانگاکەی دۆشی و نەدۆشی...)، (مندالّەکە نانەکەی خوارد و نەخوارد...). هەموو ئەمانەش بارێکی ورد و ناسکی جوان لە دەربڕیندا پێشکەش دەکەن.

شیعر و ئەدەبی کوردی، چ کۆنی و چ نوێی و تەنانەت فۆلکلۆر و میللییەکەشی پڕیەتی لەو جۆرە دژیەکە.. لە خوارەوە کۆمەڵێك نموونە لە شیعری کلاسیك دەخەینە بەرچاو.

## جۆرەکانی دژیەکی نافەرهەنگی

یەك: دەشیێ دوو وشە دژیەکەکان دوو (ناو) بن:

ـ مەسرورە بە خوێن ڕێژی و غەمناکە بەچاکی

خۆشحالّە بە ناپاکی و بێزارە لە پاکی... ئەحمەدی خانی

(پاکی و ناپاکی) لە نیوە دێڕی دووەم دوو ناوی واتایین، یەکەمیان ئەریێ و دووەمیان نەرێی یەکەمیانە، بەمەش دژیەکێکی نافەرهەنگییان دروست کردووە، دەنا لە بنجدا هەردووکیان هەر لەسەر بنەمای وشە (پاك)ە کە دروستکراون.

دوو: دەشیێ وشە دژیەکەکان دوو (راناو) بن:

ـ لە ناکەس کارییا خاکم بەسەر ڕۆیی بە با عومرم

خودا تۆ بژیێنە، تا لە ژێر قاپی کەسێ دەمرم... مەحوی

دوو وشەکانی (ناکەس و کەس) لەم دێڕەدا، وەك دوو راناوی نادیار هاتوون (کەس) ئەریێ یەو (ناکەس) نەرێیەتی، واتە راناوە (نەریێ)کە لەسەر بنەمای راناوە (ئەریێ)یەکە دروستکراوە، بەوەش (دژیەکی نافەرهەنگی)یان دروست کردووە.

سێ: دەشیێ وشە دژیەکەکان دوو (فرمان) بن، ئەمەش بەچەند شێوەیەك:

أـ دەشیێ فرمانی دووەم، کە نەرێی فرمانی یەکەمە لە رستەدا بە (نا) نەریێ کرابیێ، ئەمەش تایبەتە بە فرمانی رانەبردووی ئیخباری، لەو بارەدا (نا)ی نەرێیەکە، شوێنی (دە)ی نیشانەی فرمانە رانەبردووەکە دەگرێتەوە، بۆ وێنە:

ـ حاجی کەسێکە بێکەس، بۆ ئێوە قوڕ دەپێوێ

دویی لێدەگرن زەریفە، ناگرن بەڵا لە خۆتان.. حاجی قادری کۆیی

(دەگـرن) و (نـاگرن) دوو فرمـانی رانـەبردوون، دووەمیـان نـەرێی یەکەمیانـە، (دژیـەکی نافەرهەنگی)یان دروست کردووە.

ب ـ دەشێ فرمانی دووەم کە نەرێی فرمانی یەکەمە، لە دێڕەکـەدا بـە (نـە) نـەرێ کرابـێ، ئەمەش تایبەتە بە فرمانی رانەبردووی ئینشائی و دەمەکانی فرمـانی رابـردووی ئیخبـاری و ئینشائی.. بۆ وێنە:

ـ عالەمێکم دی نەخۆش و، یەك کەسی ساغم نەدی

دوور لە مەردانی خودا، غەیری قورمساغم نەدی.. حاجی قادری کۆیی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا فرمانەکانی (دی) و (نەدی) دوو فرمانی رابـردوون، دووەمیـان نـەرێی یەکەمیانە و بە هەردووکیان (دژیەکی نافەرهەنگی) دروست دەکەن.

ج ـ دەشێ فرمانی دووەم کە نەرێی فرمانی یەکەمە، بـە (مـە) نـەرێ کرابـێ، ئەمـەش تایبەتە بە فرمانی داخوازی، بۆ وێنە:

ـ مەڕوانە ئەمڕۆ کە بە ڕوومەت گوڵی تاکی

بڕوانە سبەینێ، کە لە نێو دامەنی خاکی.. هەردی

(بڕوانـە)و (مەڕوانـە) دوو فرمـانی داخـوازین، دووەمیـان نـەرێی یەکەمیانـە، (دژیـەکی نافەرهەنگی)یان دروست کردووە.

چوار: دژیەکی دوو چاوگ: دەشێ وشە دژیەکەکان چاوگ بن.. بۆ نموونە:

ـ بوون و نەبوونم لەلا یەکسان کە

لە وەختی غەمدا شادیم ئاسان کە... پیرەمێرد

(بوون) چاوگێکە ئەرێیە، (نەبوون) نەرێی ئەوە، لەسـەر بنـەمای ئـەو دروسـتبووە، بۆیـە هەردووکیان یەك ڕەگیان هەیە، نەك دوو ڕەگی سەربەخۆ، بەڵام دژو پێچەوانەی یەکن.

سێیەم: جۆرێکی تری (دژیەکی نافەرهەنگی) لە نێوان ئەو دوو وشانەدا بەرجەستە دەبێت، کە ئەگەر چی یەك بنج و سەرچاوەشیان هـەبێ، بـەڵام چ (ئـەرێ) کـەیان و، چ (نەرێ)کـەیان هەردووکیان بە زیاد کردنی پێشگر، یان پاشگر بۆ سەر ئەسڵی وشەکە دروسـت دەکـرێن، بـۆ

وێنە:

ـ خواناس و مەلاو بەناو و بێ ناو

خونکارە هەژارە پیرە یان لاو... ئەحمەدی خانی

لەم پارچەیەدا وشەکانی (بەناو) و (بێناو)، هەر دووکیان یەك بنچینەیان هەیە کە (ناو)ە.. (بەناو) ئەرێیە، بەواتای کەسی ناودار، پێکهاتووە لە (بە + ناو).. (بێناو)یش نەرێیە، بەو کەسە دەگوترێت، کە ناناسرێت و ناوێکی ئەوتۆی نییە، پێکهاتووە لە (بێ + ناو).. پەیوەندی نێوان هەردووکیان (بەناو) و (بێناو) پەیوەندییەکی دروستکراوە، ئێستا هەر دووانیان (دژیەکێکی نافەرهەنگی) دروست دەکەن.

## چەند جۆرێکی دیکەی دژیەك:

دژیەك بە پێی باری ئەو دوو وشانەی دروستی دەکەن، دەشێت دروست بن، واتا بۆ واتای خۆیان بەکارهاتبن، هەروەها دەشێ خوازەیی بن، واتە دوو وشەکان بۆ واتای فەرهەنگییان بەکارنەهێنرابن و بۆ واتای خوازەیی هێنرابن، یان لە نێو رستەکاندا تەواوی رستەکە بۆ واتای درکاو هاتبن، بەڵام جاری تریش هەیە دەشێ دوو دژەکان یەکیان دروست و ئەوی دیکەیان خوازە بێت.. لە خوارەوە ئەمە روون دەکەینەوە:

### ١- دژیەکی دروست (الطباق الحقیقی)

بریتییە لەو دژیەکەی، کە ئەم دوو وشانەی دروستی دەکەن، هەردووك دروست بن، وەکو ژن و پیاو، مەبەست لێیان ئەوەیە لە باری راستەقینەدا ژن و پیاوی دروست بن، نەك بۆ واتای خوازەیی بەکارهێنرابن.. بۆ نموونە:

ـ خواردن و سەتری عەورەت و سوکنا

باعیسی ژینە بۆ گەدا و پاشا... حاجی قادری کۆیی

(گەدا) و (پاشا) دوو وشەن بۆ واتای دروست هاتوونە، دوو کەسی دژ و پێچەوانەی یەك لە باری ژیانیاندا وێنە دەکێشن، بۆیە دژیەکی دروستن.

**٢- دژیەکی خوازەیی (الطباق المجازی)**

بریتییە لەو دژیەکەی، کە ئەم وشانەی دروستی دەکەن، هەردووك بۆ مەبەستی خوازەیی بەکارهاتبن.. بۆ نموونە:

ـ ئەی موحەممەد وەی ئەمینولدەولە ئەمرۆ کۆیی تۆ

جەننەتێکە کەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوورکەوتەوە... حاجی قادری کۆیی

بەکارهێنانی وشەی (جەننەت) بۆ کۆیە و (دۆزەخ) بۆ هەر شوێنێکی دووری کۆیە، کە ئەمانە دوو وشەی دژ و پێچەوانەی یەکترینە، ئەوە واتا ئەو (جەننەت) و (دۆزەخ)ە بۆ واتای دروست نەهاتوون و بۆ واتای خوازەیی هاتوونە، چونکە لە باری دروستدا نە کۆیە (جەننەت) و نە شوێنانی تریش (دۆزەخ)ن، بۆیە دژیەکی خوازەیی دروست دەکەن.

**٣ـ دژیەکی درکاو (مەکنی)**

ئەو دژیەکەیە، کە بە هەردوو وشەکانی لەو سیباقەی تێیدا هاتوون، درکەیەك دروست دەکەن، بۆ نموونە:

.دەهاتە جونبوش و لەرزین لە ماهی بگرە تا ماهی

لە سەحرا چەندە وەحشی بوون لە ترسان چوونە سەر کێوان.. حاجی قادری کۆیی

ماهی یەکەم: ماسی، کینایەیە لە نزمی

ماهی دووەم: مانگ، کینایەیە لە بەرزی.. بەمەش دژیەکێکی مەکنی جوان دروستبووە.

**٤ـ دژیەکی دروست بە خوازە**

ئەو دژیەکەیە، کە یەك لە وشەکانی دروستن و بە واتای فەرهەنگی هاتووە، بەڵام وشەکەی تری دروست نییە و بە واتای خوازەیی هاتووە، بۆ نموونە:

ـ ئەتۆ ماوی لە نووققادی ویلایەت

ئەوانی تر هەمووی بوونە حیکایەت... حاجی قادری کۆیی

ماوی: فرمانی رابردووە، دروستە.. حیکایەت، ناوە، خواستراوە بۆ (مردوون)، چونکە ئەگەر یەکێك مرد، ئیتر دەبێتە حیکایەتی سەر زاران و بەسەردەچێ.. ئەمەش دژیەکی تێکەڵی دروست بە خوازەیە.

### ٥ـ دژیەکی ئاشکرا (الطباق الظاهر)

بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو واتای بە ئاشکرا دژ و پێچەوانەی یەك، جا فەرهەنگی بن، یان نافەرهەنگی.. بۆ نموونە:

ـ ئەو ڕزقی موقەڕڕەرە بە خۆی دێ

سەد دەفعە بخوازی یا نەخوازی... حاجی قادری کۆیی

(بخوازی) و (نەخوازی) دوو فرمانی دژ و پێچەوانەی یەکن، بە ئاشکرا دیارە کە دووەم نەرێی یەکەمە.

### ٦ـ دژیەکی نائاشکرا (الطباق الخفي)

بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو واتا، یەکێکیان پەیوەندی هەیە بە وشە دژەکەی ئەوی تر، جا پەیوەندییەکە پەیوەندی بۆیەك پێویستی، یان پەیوەندی هۆیی بێ.. بۆ نموونە:

ـ سەد قائیمە و قەسیدە کەس نایکڕێ بە پوولێ

ڕۆژنامە و جەریدە کەوتۆتە قیمەت و شان... حاجی قادری کۆیی

لە نیوە دێڕی یەکەم فرمانی (نایکڕێ) هاتووە، کە خراوەتە دوای قائیمە و قەسیدە، مەبەستیش بێ ڕەواجی قائیمە و قەسیدەیە، دەبوو لە نیوە دێڕی دووەم (دەیکڕێ) بێ، چونکە ئەمە دژ و پێچەوانەکەی فرمانی (نایکڕێ)یە، بەڵام ئەمە نەهاتووە و گوتراوە (ڕۆژنامە و جەریدە کەوتوونە قیمەت و شان)، واتە ئەم دووانەی دوایی ڕەواجیان پەیدا کردووە، ئەوەش واتە: خەڵك دەیانکڕێ، چونکە هەر شتێك بە ڕەواج بێ، بێگومان بەرناکەوێ و بە زۆری دەکڕدرێ. بەمەش دەبینین لە ڕووی واتاوە نیوە دێڕی یەکەم و دووەم دژ و پێچەوانەی یەکن، بەڵام وەکو گوتمان دژیەکییەکە ئاشکرا نییە، بۆیە دژیەکی نائاشکرا لەم نموونەیە بەرجەستە بووە.

### دژیەکی وێنەی تاك و دژیەکی وێنەی جوڵاو:

بە پێی ئەو وێنەیەی دژیەك دروستی دەکات، دەشێ دوو جۆر وێنەمان بۆ دروست بێت، بریتینە لە وێنەی وەستاو و تاك و وێنەی جوڵاو.. لە خوارەوە تیشك دەخەینە سەر ئەم دووانە:

### ١ـ دژیەکی وێنەی تاك

ئەو دژیەکەیە، کە دوو وشە دژ و پێچەوانەکانی گوزارشت لە حاڵەتێکی تاك، یان وێنەیێکی زەینی چەسپاو دەکەن.. بۆ نموونە:

ـ سەیری چەند سەیرە حاڵی ئەم عەشقە
بێوجوودی وجوودە، بێحزووری حزوور... حەمدی

(بێوجود) و (وجود) لەگەڵ (بێحزور) و (حزور) دوو وێنەی تاك و چەسپاوی دژو پێچەوانەی یەك دەخەنە بەرچاو.

### ٢ـ دژیەکی وێنەی جوڵاو

ئەو دژیەکەیە، کە دوو وشە دژ و پێچەوانەکانی گوزارشت لە وێنەیێکی واقیعی جوڵاو دەکەن.. بۆ نموونە:

ـ کە دایهێناو هەڵی نا چاوی مەستی
ڕەوان فیدا دەکەم دڵ چاکی هێنا... حاجی قادری کۆیی

(دایهێنا چاوی) وێنەییێکە و (هەڵی نا چاوی) وێنەیێکی تر، دژو پێچەوانەی یەکترین، چونکە دوو دیمەنی جوڵاوی پێچەوانەی یەکتری پیشان دەدەن.

ـ سەرم سوڕما گەلێ دەمرێ لە بۆ گەل شین و گریانە
گەلێکیش مردنی هۆی جەژن و شایی و چەپڵە ڕێزانە... چروستانی

لێرەدا دوو وێنەی جوڵاو و سینەمایی دژبەیەك دەکەنە بەرچاومان، یەکەمیان بە مردنی کەسانێك شین و گریان ڕوودەدات و دووەمیشیان بە مردنی کەسانێکی تر جەژن و خۆشی بەرپا دەبێ ئەوەش دوو وێنەی دژ و پێچەوانەی یەکن.

### دژیەکی بنجی و دژیەکی تێکەڵ:

بە پێی بوونی بنجی دوو وشە دژیەکەکان، دوو جۆر دژیەکمان بۆ بەرجەستە دەبێت، یەکیان دژیەکی بنجی و ئەوی دیکەیان دژیەکی تێکەڵە.. لە خوراوە تیشك دەخەینە سەر ئەم دوو جۆرە:

### ١ـ دژیەکی بنجی

ئەو دژیەکەیە، کە دوو وشەکانی روون و سەربەخۆبن و لە فەرهەنگ، یان لە دەرکەوتندا تەواو پێچەوانەی یەك بن.. بۆ نموونە:

ـ هەموو عومرم لە رێی هات و نەهاتی
بەسەرچوو ئەی ئەجەل تۆ هەر نەهاتی... حاجی قادری کۆیی

(هات) و (نەهاتی) دوو وشەن روون و لە دەرکەوتندا تەواو دژ و پێچەوانەی یەکترینە.

### ٢ـ دژیەکی تێکەڵ

ئەو دژەیەکەیە کە دوو وشەکانی روون و سەربەخۆن، بەلاّم لە فەرهەنگدا چ دژیەکی و پێچەوانەییەکیان نییە.. بۆ نموونە:

ـ کاکە ئێمە موئمنین نە رووسین
بۆچ کفرە زوبانمان بنووسین... حاجی قادری کۆیی

لە نیوە دێڕی یەکەم لە بەرامبەر وشەی (موئمن) وشەی (رووس) بەکار هاتووە، کە لە راستیدا دەبوو بلّیّ: نە (کافر)، چونکە دژەواتای (موئمین) وشەی (کافر)ە نەك (رووس)، لەمەشدا شتێکی بە شتێکی دیکەدا تێکەڵکردووە، چونکە وەهای داناوە کە رووسەکان موسڵمان و ئیماندار نینە، ئەمەش لە باری واقیعیدا مەرج نییە سەدا سەد دروست بێ، بەلاّم ئەو دێڕە شیعرە، شیعریش وەکو مێژوو حیسابی راستی و وردی بۆ ناکرێت، چونکە ناکرێ راستەقینەی واقیع و مێژوو وەکو خۆی بگوازێتەوە، ئەمە هەروەها دژیەکی دووریشی پێدەگوترێت و ناوی دیکەیشی لێنراوە.

## دژیەکی تاك حاڵەت و دژیەکی فرە حاڵەت:

### ١ـ دژیەکی تاك حاڵەت

ئەوەیە لە دێڕە شیعرێکدا یەك جووتە وشەی دژ و پێچەوانەی یەکتری بە جودا هاتبن، بۆ نموونە:

ـ پادشاهێکم هەیە گەر من بکاتە دەرگەوان
حاجیب و خادیمی من ئەسکەندەر و دارا دەبێ... حاجی قادری کۆیی

(پادشا) و (دەرگەوان) دوو وشەی دژو پێچەوانەی یەکن، لەم دێڕەدا هەر ئەو دژیەکە هێنراوەو چی دیکەی بەدوادا نەهاتووە.

### ٢ـ دژیەکی فرە حاڵەت

ئەو دژیەکەیە لە دێڕە شیعرێکدا زیاتر لە چەند حاڵەتێکی بەدوای یەکتریدا دێن.. بۆ نموونە:

ـ بێدەرپێ ئەبینم بوونە ساحێبی دەرپێ

بێجێ هەموو دیارن بوونە ساحێبی ڕێ و جێ... حەمدی

(دەرپێ) و (بێ دەرپێ)، هەروەها (بێجێ) و (جێ) دوو ناوی دژ و پێچەوانەی یەکن، لە فەرهەنگدا یەك ریشەیان هەیە، بەڵام دووەم نەرێی یەکەمە، بۆیە دژیەکی نافەرهەنگین لە ناو.

ـ ئەوا ئاوابوو ڕۆژی من، ئیتر ژینم لە دونیا چی؟

لە هات و چۆ و لە گریان و لە ناڵەی سوبح و شامم چی... ئەخۆل

(ئاوابوو ڕۆژی من) واتە، (مردم) دژیەکە لەگەڵ (ژین).. (هات) دژیەکە لەگەڵ (چۆ).. (سوبح) دژیەکە لەگەڵ (شام).

### دژیەکی ئاشکراو دژیەکی شاراوە:

### ١ـ دژیەکی ئاشکرا

ئەو دژیەکەیە، کە لە دوو بنەڕەتەکانی دژیەك (دوو وشە، یان رستەکانی دژیەك) هەردووکیان دەمێنن و هیچ یەکیان لانەبراون.. بۆ نموونە:

ـ ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد

موژدەی بەیانی بۆ گەلی دوور و نزیك ئەبرد.. پیرەمێرد

(دوور) و (نزیك) دوو ئاوەڵناون، بە ئاشکرا دیارن لە واتادا دژ و پێچەوانەی یەکترن، بەوەش دژیەکی ئاشکرا بەرهەمهاتووە.

شایانی باسە: لە باری ئاساییدا هەموو دژیەکێك دژیەکی ئاشکرایە، ئەو نموونانەی سەرووشمان هەموویان دژیەکی ئاشکران.

### ١ـ دژیەکی شاراوە

ئەو دژیەکەیە، کە لە دوو بنەڕەتەکانی دژیەك (دوو وشە، یان ڕستەکانی دژیەك) یەکیان بێنن و یەکیان لابرابن، بەڵام بە سیاقی دەربڕینەکە، بتوانین لابراوەکە ببینینەوە.. بۆ نموونە:

ـ هەتا تۆ بووی لە شار شام و نەهار گۆشت و پلاوم بوو

بە شۆرباوێکی بێ تام ئێستا زۆر مەمنونم و ڕازی... مەلا مەعروفی کوکایی

لەم دێڕەدا، کە دەڵێت: تا (تۆم هەبوو) نیوەڕۆ و ئێوارە گۆشت و پلاوی باشم هەبوو، بەڵام ئێستا بە شۆرباش ڕازیم، بۆ ئێستا بە شۆربا ڕازییە، چونکە ئێستا (تۆ نەماوی)، جا مەبەستی شاعیر ئەوەیە، کە ئێستا تۆ نەماوی بۆیە بە شۆربا ڕازیمە، ئەوەش کەواتە لە دوو لایەنەکانی دژیەکییەکە (تۆم بوو) و (تۆم نەما)، دووەمیان لابراوە، بەوەش دژیەکی شاراوە بەرهەم هاتووە.

### دژیەکی وەهمی:

بریتییە لە بوونی دو وشە، کە لە ڕواڵەتدا دژ و پێچەوانەی یەکترینە، بەڵام لە ڕاستیدا چ پەیوەندییەك لە نێوانیاندا نییە، هێندە هەیە شێوەیان لە یەك دەچێت.. بۆ نموونە:

ـ دەمێکە ئینتیزاری هاتنی دەور و زەمانێکم

لە دوونانم فەرقکا چونکە من موحتاجی نانێکم... حەمدی

دوونان .. واتە نزم نەك دوو دانە نانی دژی یەك نان

نان: واتە یەك نان

لە ڕواڵەتدا دوونان دژیەکی نانێکە، بەڵام لە ڕاستەقینەدا چ پەیوەندییەك لە نێوان ئەم دوو وشەیە نییە.

ـ ئەتۆ مەصنوعی چیت داوە لە صانیع؟

لە زانینی ئەوە نادانە دانا... حاجی قادری کۆیی

لە ڕواڵەتدا (نادان) دژیەکی نافەرهەنگی (دانا)یە، بەڵام لە ڕاستیدا وانییە، (نادان) بە واتای نەزان و (دانا) بە واتای حەکیم دێت.

## چەند نموونەیەکی دژیەکی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا:

ـ لەم لاوە هەتا حاجی نەچێتە ئەولا

مومکین نییە تێبگا لەوە گەر بفڕێ... حاجی قادری کۆیی

(لەم لاوە) خۆی لە (ئەم لاوە)یە، (ئەم... ە) کە بە تەنها (م ... ە)ەکەی ماوە، ئاوەڵناوی نیشانەیە بۆ نزیك و (ئەو لا) کە خۆی (ئەو لایە)یە، (ئەو... ە) بە تەنها (ئەو)ی ماوە، ئاوەڵناوی نیشانەیە بۆ دوور، دژ و پێچەوانەی یەکن، فەرهەنگینە.

ـ ئەم دەستە کە چوو دەستەیەکی تازەیە دێ

مەعلوم نەبوو ئەم کەشمەکەشە کەی دەبڕێ... حاجی قادری کۆیی

(چوو) و (دێ) دوو فرمانن، یەکەمیان رابردوو و دووەمیان رانەبردووەو دژ و پێچەوانەی یەکترین.

ـ سەیرە هەرکەس ڕوو دەکاتە ئەم خەراباتەی وجود

کاسەکەی هەرچەندە پڕتربێ ئەوەندە بۆشترە... حەمدی

(پڕتر) و (بۆشتر) دوو ئاوەڵفرمانی دژو پێچەوانەی یەکن، تەواوکەری فرمانی ناتەواوی (بێ) و (ە)نە، لە فەرهەنگدا وشەی سەربەخۆن، بۆیە دژیەکی فەرهەنگی لە ئاوەڵفرمانی چۆنی بە ئاوەڵفرمانی چۆنیینە.

ئەمانەو دەشێت لەمڕووەوە چەندین جۆری دیکەی دژیەك هەبن.

## بەرامبەری:

یەکێکی دیکەیە لە هونەرە گرنگەکانی جوانکاری وشەیی، لەسەر بنەمای دژیەکی نێوان چەند وشەیەکی بەرامبەر بەیەك هاتوو دادەمەزرێت، بەڵام لە (دژیەك) بەهێزتر و جوانترەو دەسەڵاتێکی گەورەتری خاوەنەکەی پیشان دەدات.. لە عەرەبیدا (المقابلە)ی پێدەڵێن.. بریتییە لە بوونی بە لانی کەم چوار وشە، دوویان لە بەشی یەکەمی ئاخاوتن و دووەکانی تر لە بەشی دوای ئەوەوە بێن، بەو مەرجەی پەیوەندی نێوان هەر وشەیەکی بەشی یەکەم و وشە بەرامبەرەکەی لە بەشی دووەمدا پەیوەندییەکی دژیەکی بێت.. بۆ نموونە:

ـ با وجودی ئەم هەموو تەكلیفە گێژیان كردووم

كوڕ خەیاڵی ژن ئەكات و كچ دەڵێ من شوودەكەم... شێخ ڕەزا

لە نیوە دێڕی دووەمدا، سەرەتا وشەكانی (كوڕ) و (ژن) هاتوون، ئینجا لە كۆتایی ئەم نیوە دێڕەدا وەك بەرامبەری وشەكانی پێشوو، دوو وشەی (كچ) و (شوو) هاتوون. پەیوەندی نێوان (كچ) و (كوڕ) پەیوەندی دژیەكی و پەیوەندی نێوان (شوو) و(ژن)یش دیسانەوە پەیوەندی (دژیەك)ییە، بەوەش نموونەییەكی (بەرامبەری) لەو دێڕەدا بەرجەستەبووە.

ـ تۆ یوسفی نەو حوسنی لەسەر میسری جینانی

من پیرم و فانی

لەم كولبەیی ئەحزانە نە زیندووم و نە مردووم

هەروا بە تەماتم... نالی

لێرەش لە دێڕی یەكەمدا لە بەشی یەكەمی گوتەكە دوو وشەی (تۆ) و (یوسفی نەو حوسن) هاتوونە، لە پاشان بە دوای ئەوان دوو وشەی تر هاتوونە، كە بریتینە لە (من) و (پیری).. (من) لە بەرامبەر (تۆ) و (پیری) لە بەرامبەر (یوسفی نەو حوسن) وەستاون، كە پەیوەندی نێوان ئەم وشانە لەگەڵ یەكتری (دژیەكی)یە، بۆیە بەمەش (بەرامبەری)یەكی تر دروستبووە.

ـ تەبیە كە یەعنی ڕۆژ و شەوی تیبی عالەمە

ڕۆژی كە وشكە شەو تەڕە كافور و عەمبەرە... نالی

لێرەش لە نیوە دێڕی دووەمدا لە بەشی یەكەمی گوتەكە دوو وشەی (ڕۆژ) و (وشكە) هاتوونە، لە پاشان بە دوای ئەوان دوو وشەی تر هاتوونە، كە بریتینە لە (شەو) و (تەڕ).. (شەو) لە بەرامبەر (ڕۆژ) و (تەڕ) لە بەرامبەر (وشك) وەستاون، كە پەیوەندی نێوان ئەم وشانە لەگەڵ یەكتری (دژیەكی)یە، بۆیە بەمەش (بەرامبەری)یەكی تر دروستبووە.

ـ نەمان و مانی عالەم تابیعی وەختی موعەییەن بێ

بە من چی مردنی دوژمن لە مانی دۆستانم چی... حەمدی

له نیوه دێڕی دووەمدا سەرەتا (مردنی دوژمن) بەسەریەکەوە هاتووە، بەڵام پاش ئەوە (مانی دۆستان) هاتووە، (مان) لە بەرامبەر (مردن) و (دۆست) لە بەرامبەر (دوژمن) بەمەش (بەرامبەری) دروستبووە.

**بەرامبەری بە بەرچاوگرتنی ژمارەی وشە بەرامبەرەکان:**

بە بەرچاوگرتنی ژمارەی ئەو وشانەی بەرامبەرییەکە دروست دەکەن بەرامبەری ئەم جۆرانەی خوارەوەی هەیە:

١ـ بەرامبەری دوویی: لێرەدا ژمارەی وشەکانی هەردوو گروپە بەرامبەرەکان دوونە، هەر وشەیەکەیان لە گروپی دووەم لە بەرامبەر وشەیەکی گروپی یەکەم هاتووە، جا بە ڕێکی بێت، یان بە ناڕێکی.. بۆ نموونە:

ـ بنوارە بوونی ئەووەلت و چوونی ئاخیرت

هاتی چ ڕووت و قووت و هەڵاتی چ لووس و پووس... نالی

چوونی ئاخر لە بەرامبەر بوونی ئەووەل هاتووە، بەرامبەری دووییە.

ـ نە ئەمرێکم بەجێ هێنا دڵی پێ خۆش بکەم جارێ

نە خۆم لادا لە نەهییێکت موفەڕڕەح بێ کە ئیمانم... حەمدی

لە سەرەتادا وشەکانی (ئەمر) و (بەجێهێنان) هاتوون، دواتر بە ناڕێکی بە دوایاندا وشەکانی (نەهی) و (خۆلادان) لە بەرامبەریان هاتوون، (نەهی) لە بەرامبەر (ئەمر) و (خۆلادان) لە بەرامبەر (بەجێهێنان)، بەوەش بەرامبەری دوویی ناڕێك بەرهەمهاتووە.

ـ بە هاوین جەستە خەستەی دەردی گەرمام

بە زستان دڵشکستەی بەردی سەرمام... نالی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا، بەڕیزە وشەکانی (هاوین) و (گەرما) هاتوون، لە نیوە دێڕی دووەمیش وەك (بەرامبەری) ئەم دوو وشانە، بەڕیزە وشەکانی (زستان) و (سەرما) هاتوون. پەیوەندی نێوان وشەکانی (هاوین) و (زستان)و هەروەها پەیوەندی نێوان وشەکانی (گەرما) و (سەرما)ش پەیوەندی (دژیەك)ییە، بەو شێوەیەش (بەرامبەرییەکی دوو بە دوو) بیمان بۆ دروستبووە.

٢ـ بەرامبەری سێیی: لێرەدا ژمارەی وشەکانی هەردوو گروپە بەرامبەرەکان سێ وشەن، هەریەکەیان لە گروپی دووەم لە بەرامبەر وشەیەکی گروپی یەکەم هاتووە، جا بە ڕێکی بێت، یان بە ناڕێکی.. بۆ نموونە:

ـ کە ڕۆژی وەصلی ئاوابوو بە چاو گریان نەکەم چی بکەم؟

شەوی هیجرانی وا داهات کە دڵ بریان نەکەم چی بکەم؟... صافی هیرانی

لە نیوە دێڕی یەکەم وشەکانی (ڕۆژ) و (وەصل) و (ئاوابوو) هاتووە، لە بەرامبەریان لە نیوە دێڕی دووەمدا وشەکانی (شەو) و (هیجران) و (داهات) هاتوون، (شەو) لە بەرامبەر (ڕۆژ)، (هیجران) لە بەرامبەر (وەصل)، (داهات) لە بەرامبەر (ئاوابوو)، پەیوەندی هەر سێ جووتە وشەکە لە هەردوو نیوە دێڕەکان لە بەرامبەر یەك هاتوون، پەیوەندی دژیەکییە، بەوەش بەرامبەری سێیی بەرهەمهاتووە.

ـ لە جێگەی شادی و بەزم و پێکەنین

بەشی من هەر غەم، مەینەت و قارە... لوتفی

دەبینین، لە نیوە دێڕی یەکەم، لەو دێڕەدا، وشەکانی (شادی) و (بەزم) و (پێکەنین) هاتوون، بەرامبەریشیان لە نیوە دێڕی دووەمدا، وشەکانی (غەم) و (مەینەت) و (قار) هاتوون، بەوەش (بەرامبەری سێیی) یان دروست کردووە.

٣ـ بەرامبەری چواری: لێرەدا ژمارەی وشەکانی هەردوو گروپە بەرامبەرەکان چوارن، هەریەکەیان لە گروپی دووەم لە بەرامبەر وشەیەکی گروپی یەکەم هاتووە، جا بە ڕێکی بێت، یان بە ناڕێکی.. بۆ نموونە:

ـ لە زوڵماتی جەهلدا نین، کەچی مەجهولن و غائیب

لە عینوانی عیلمدا نین، کەچی مەعروف و مەعلومن... حەمدی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا سەرەتا (زوڵمات) و (جەهل) و (مەجهول) و (غائیب) بەسەریەکەوە هاتووە، بەڵام پاش ئەوانە لە نیوە دێڕی دووەمدا (عینوان) و (عیلم) و (مەعروف) و (مەعلوم) هاتوونە، (عینوان) لە بەرانبەر (زوڵمات) چونکە عینوان ئاشکراو زوڵمات شاراوەو لە تاریکیدایە، دژیەکن، (عیلم) لە بەرانبەر (جەهل) دژیەکن، (مەعروف) لە بەرامبەر (مەجهول) دژیەکن، (مەعلوم) لە بەرامبەر (غائیب) دژیەکن، بەمەش (بەرامبەری چواری) دروستبووە.

## جیاوازی نێوان (دژیەك) و (بەرامبەری):

دەشێت گرنگترین جیاوازی نێوان (دژیەك) و (بەرامبەری) لەوەدا کورت بکرێتەوە، کەوا: (دژیەك) لەو دێڕ و رستانەدا بەرجەستە دەبێت، کە تیایاندا بە تەنیا دوو وشەی دژبەیەك دێن.. بەڵام (بەرامبەری) لە دێڕ و رستانەدا بەرجەستە دەبێت، کە بەلانی کەم تیایاندا وشە دژیەکەکان لە چوار وشە کەمتر نەبن، جا ئەگەر زیاتریش بن ئاساییە، بەڵام بەو مەرجەی لە بەشی یەکەمی گوتەکە دوو وشە، یان سێ وشە و زیاتربێت، لە بەرامبەریشیاندا لە بەشی دووەمی گوتەکە بە قەد ژمارەی ئەوانەی پێشوو وشەی تر هاتبن، نەك بەو شێوەی کە هەر جارەی وشەیەك هاتبێ و یەکسەر دژیەکەکەی بەدوایدا هاتبێ، چونکە بەو شێوەیە ئەگەر دێڕێك زیاتریش لە چوار وشەی دژیەکی تیاهاتبێت هەر (دژیەك)ەو (بەرامبەری)ی دروست نەکردووە.. بۆ وێنە:

ـ هەرچی کە هەیە، لە زۆر هەتا کەم
گشتی ڕائەکا، لە بوون بۆ عەدەم... لوتفی

ئەوەتا لەم دێڕەدا، لە نیوەی یەکەمی وشەکانی (زۆر) و (کەم) بەدوای یەکدا هاتوون و (دژیەك)یان دروست کردووە، لە نیوەی دووەمیشیدا وشەکانی (بوون) و (عەدەم) هاتوون و (دژیەك)یان دروست کردووە، ئەم جۆرە دێڕانەش بە نموونەی (دژیەك) دەناسرێن، چونکە وەك گوتمان دوو وشە دوو وشە نەهاتوون، بەڵکو هەرجارەی وشەیەك هاتووە، یەکسەر دژەکەشی بە دوایدا هاتووە. بەوەش (بەرامبەری) دروست نەبووە، بەڵام ئەگەر سەیری ئەم دێڕەی خوارەوە بکەین:

ـ لە جێگەی شادی و بەزم و پێکەنین
بەشی من هەر غەم، مەینەت و قارە... لوتفی

دەبینین، لە نیوە دێڕی یەکەم، لەو دێڕەدا، وشەکانی (شادی) و (بەزم) و (پێکەنین) هاتوون، بەرامبەریشیان لە نیوە دێڕی دووەمدا، وشەکانی (غەم) و (مەینەت) و (قار) هاتوون، بەوەش (بەرامبەری) یان دروست کردووە.

**موشاكەلە:**

ئەم هونەرە بریتییە لە باسكردنی شت بە وشەی غـەیری خـۆی، لەبـەر ئـەوەی كەوتۆتـە هاوەڵێتی ئەو، جا بە دروست (تحقیق) بێ، یان بە خەملاندن (تقدیر).. بـۆ نموونـە: (پاداشـتی خراپە خراپەییێكی وەكو خۆیەتی).. لێرەدا مەبەست لە خراپەی دووەم پاداشتی دادگرانەیە بـۆ خراپەكەی یەكەم، بەڵام لەبەر ئەوەی لە هاوەڵێتی ئەودا هاتووە، بە هەمان وشە پاداشتەكە بە خراپەكە ناوزەد كراوەتەوە، ئەوەش دروستەكەیە، هەرچی خەملاندنەكەیە، لە قورئانی پیرۆزدا (سیبغەتوڵڵا) لە بڕی (ئیمان بە ئەڵڵا) هاتووە، ئەوەش خەملاندنەكەیە، كە بـە واتـای ئـەوە هاتووە، ئیمان وەكو (سیبغەتوڵڵا)یەو دڵان خاوێن و جوان دەكاتەوە.. بۆ نموونە:

قەرزدارێك بۆ كڕینی ئۆتۆمبێلەكەی هەندێ پارەی لە یەكێك لە هاوڕێكانی قـەرزكردبوو، ساڵێكی زیاتر پێچوو، نەیبوو قەرزەكە بداتەوە، خاوەن قەرزیش شەرمی دەكـرد داوای پـارەی خۆی بكاتەوە، ڕۆژێكیان ژن و پیاوەی قەرزار دەچنە ماڵی كابرای خاوەن قەرز، ژنەكە دەڵێت: ساڵێك و سێ مانگە ئۆتۆمبێلمان كڕیوە.

كابرای خاوەن قەرز بە هەڵی دەزانێ، بۆ ئەوەی قەرزەكەیان بەبیربێنێتـەوەو دەڵێـت: چـۆن چۆن؟! نا ئەوەندە نابێت، ئۆتۆمبێلتان كڕیوە!

ژنە بێ ئاگا لەوەی كە چۆن تێكەوتووە، دووبارەی دەكاتەوەو دەڵێت: بە خوا ساڵی پـار لـە ئەوەندەی ئەوەندە كڕیومانە؟

كابرای خاوەن قەرز دەڵێت: وەڵڵا ئەگەر وا بێ! گەلەك لە مێژە سەیارەتان كڕییە!!

یانیش دەڵێن: لە هەژارێكیان پرسی: شیعری (نالی)ت پێ خۆشترە، یان شیعری (بێكەس)؟

هەژارەكە وەڵام دەداتەوە: وەڵڵاهی لەفەیەكم پێ خۆشترە.

ـ ئاغایەك بە شوانەكەی خۆی گوت: هەر چاكە چاكە!

شوانەكەش لەبەر ئەوەی زۆری حـەز لـە (چـایە) بـوو، ڕستـەكەی بـە شـێوەیەكی دیكـە دووبارەكردەوە، گوتی: ئەرە وەڵڵا گەورەم.. هەر چا كە چاكە!

ـ لە جوتیارێكیان پرسی

چاوەڕوێی چی؟

پێتان بدەین تۆوی نایاب

یان پەینی كیمیاوی زۆر چاك

وتی: سوپاس

چاوەڕوانین خوا بارانمان بۆ ببارێنێ.

واتە: چاوەڕوانی هیچ نینە لە ئێوە.

لە شیعری کلاسیکیشدا نموونەی موشاکەلە زۆر بەرچاو دەکەون، لەوانە:

ـ سەد قوببەیی خەورنەق و سەددی سکەندەری

ناگاتە بەیتە کاولی (نالی) و مەتانەتی... حاجی قادری کۆیی

(قوببەیی خەورنەق و سەددی سکەندەری) ئەمانە شتی ماددینە و چوێنراون بە (بەیتە شیعری نالی)، لەبەرئەوەی لە هاوەڵێتی یەك هاتوون، شاعیر هەلی وەرگرتووەو گوتوویەتی بەیتە کاولی نالی، کە لە راستیدا کاول سیفەتی بەیتی دروستە کە (ماڵ)ە، نەك (بەیتی شیعر)، مەتانەت و هێز و قایمیش هەر هی بەیتە لە بەرد و ئاسن دروستکراوەکانە نەك هی بەیتە شیعر، بەڵام چونکە پێکەوە هاتوون شاعیر هەلی وەرگرتووەو موشاکەلەی لێ دروست کردووە.

ـ وەك موحەمەد حەنیفە بەیتی مەتین

نییە ئیللا حەساری قوستەنتین... حاجی قادری کۆیی

ئەمەش بە هەمان شێوەی پێشووە، بەڵام ئەمجارە بە هەڵگەڕێنراوەیی، چونکە بەیتی محەمەد حەنیفە چیرۆکە شیعرە و واتاییە، کەچی حەساری قوستەنتینییە لە ماددەی بەهێز و سەخت دروستکراوە، ئەمە لەبەر هاتنی وشەی بەیتەکە، کە شاعیر هەلی پێ وەردەگرێ، دێت موشاکەلەکەی پێ دروست دەکات و دوو شتی ماددی و مەعنەوی پێکەوە دەبەستێتەوە، کە لە راستیدا پێکەوە نابەسترێنەوەو ناشێ پێکەوە بەراورد بکرێن، ئەمەش جوانییەکی دڵگیر پێشکەش دەکات.

ـ خۆ لابدەن لە باری گرانی حقوقی خەڵك

بنوارە هەڵگری کە لە فیلەی حەماڵ ئەچێ... حەمدی

باری گرانی حقوق جیایە لە باری گرانی شتانی تر، چونکە شتانی تر کە باردەکرێن لەسەر مل، یان لەسەر هەر شتێکی تر شتی ماددیینە، بەڵام (حقوق) شتێکی مەعنەوییە، شاعیر

لەبەرئەوەی ئەم دووشتانە پێکەوە هاتوون، موشاکەلەی دروست کردووە و بە گاڵتەو بۆ خۆشی ئەوەی حەقی خەڵکی لە ملە، ئەو کەسەی بە فیلەی حەمال چوواندووە، کە چ لێکچوواندنێك لە نێوان هەردووکیاندا نییە.

ـ کاشکێ ئەوسا ئەسیری دەستی ئینگلیزی دەبووم
نەك بکەومە داوی زلف و پەرچەمی پڕ پێچی یار... حەمدی

موشاکەلەشە، چونکە ئەم دوو ئەسیرییە چ پەیوەندییەکیان پێکەوە نییە، کە لە نیوە دێڕی یەکەم باسی ئەوە دەکات: خۆزگا ئەسیری ئینگلیز دەبووم، عەقڵ بۆ ئەوە دەڕوات، کە ئێستا دەڵێت: بەڵام ئێستا بوومەتە ئەسیری ئەم وڵاتە لە ئینگلیز خراپترە، کەچی کە دێڕەکەی تەواو دەکات و دەڵێت: نەك بکەوتمایەتە دیلی زولفی ئەو یارە!! ئەمە خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە بەهەڵەچووە، شاعیر موشاکەلەی لە نێوان دوو شت کردووە، کە ئەوانیش سوپای داگیرکەری ئینگلیز و کاریگەری پەرچەمی یارن، ئەم دووشتەش لە دوو کەناڵێ لێکتر جیاوازن و یەك شت نینە و دووەم جێگەی یەکەم ناگرێتەوە، بەوەش موشاکەلە بەرهەم هاتووە.

**پێچە و پەخشە:**

لە عەرەبیدا (اللف والنشر)ی پێدەگوترێت.. ئەوەیە چەند وشەیەك بە دوای یەك بێنی و پاشان بە قەد ئەوانەوە وشەی تر بێنی، کە پەیوەندییان بە وانەی پێشەوە هەبێ، بێ ئەوەی دیاری بکەی کام وشە بۆ کام وشە دەگەڕێتەوە، چونکە خوێنەر دەتوانێ هەر وشەیەك بۆ ئەوە بباتەوە، کە پەیوەندی پێوە هەیە.. دیارە لێرە مەرج ئەوەیە ژمارەی وشەکانی بەشی یەکەمی گوتەکە و ژمارەی وشەکانی بەشی دووەمی گوتەکە بە قەد یەك بن و پەیوەندی نێوانیشیان دەشێت بەیەکەوە گونجان و بۆیەك شیان و پەیوەستی و دژیەکی یان هەر پەیوەندییەکی تر بێت، بەڵام پەیوەندی نێوان هەموویان دژیەکی نەبێت، چونکە لەو بارەدا دەبێتە (بەرامبەری).. بۆ نموونە:

ـ عەجەب نالی بە قووەت و حیکمەت ئەدای دەکا
مەعنای زۆر و گەورە، بەوشەی کەم و بچووك.. نالی

لە بەشی یەکەمی نیوە دێڕی دووەمی ئەو دێڕە، سێ وشەی (مەعنا) و (زۆر) و (گەورە) بە

دوای یەكدا هاتوون، لەبەشی دووەمیشدا، دوا بە دوای ئەو سێ وشانەو وەك بەرامبەری ئەوان، سێ وشەی (وشە) و (كەم) و (بچووك) هاتوون، بۆ ئەوان دەگەڕێنەوە.. پەیوەندی نێوان (مەعنا) و (وشە) پەیوەندییەكی بە دوای یەكدا هاتووە، چونكە كە (وشە) هەبێ، دەبێت (مەعنا)ش هەبێت، كە (مەعنا)ش ببێ، دەبێت (وشە)ش ببێ.. هەرچی پەیوەندی نێوان وشەكانی (كەم) و (زۆر) و وشەكانی (گەورە) و (بچووك) یشە پەیوەندییەكی دژیەكییە، بەمەش (پێچە و پەخشە)مان بۆ دروستبووە.

## جۆرەكانی (پێچە و پەخشە)

**یەكەم:** بەگوێرەی ژمارەی ئەو وشانەی (پێچە و پەخشە) كە دروست دەكەن، ئەم جۆرانەی (پێچە و پەخشە) هەن:

**١ـ (پێچە و پەخشە)ی دوویی:**

ـ چڵ و جۆكەر مەدە دەورم، خودا حافیز نەصیحەت گەر

لە شەكوەی عیشق و لۆمەی عەقڵ، ئەمن هەم لاڵم و هەم كەڕ... مەحوی

لە بەشی دووەمی نیوە دێڕی دووەمدا، (لاڵ) و (كەڕ) لە بەرامبەر دوو وشەكانی بەشی یەكەمی ئەو نیوە دێڕە (شەكوە) و (لۆمە) هاتوون.. پەیوەندی نێوان (لاڵ) و (شەكوە)و پەیوەندی نێوان (كەڕ) و (لۆمە) پەیوەندییەكی بەدوای یەكدا دروستبووە، بەمەش (پێچە و پەخشە)یەكی دوو بە دوویمان بۆ دروستبووە.

**٢ـ (پێچە و پەخشە)ی سێیی:**

ـ جگەر كون كە، خوێنی گریە بەردە، سینە هەڵبدڕە

نیگاهێ كە، ببینە كاری تیر و نەشتەر و خەنجەر... مەحوی

لە نیوە دێڕی یەكەمدا شاعیر سێ شتی بە دوای یەكدا پێچاوەتەوە، كونكردنی جگەر و، بەردانی خوێنی گریە و، هەڵدڕینی سینە، دوابەدوای ئەمانەش لە نیوە دێڕی دووەمدا باسی لە كاری (تیر) و (نەشتەر) و (خەنجەر) كردووە، دیارە (تیر)ەكە بۆ كونكردنی جگەر ، (نەشتەر)ەكە بۆ شەقكردنی چاو و بەردانی خوێنی تیا قەتیس ماوی گریە ، (خەنجەر)ەكە بۆ هەڵدڕینی سینە بەكاردەهێنرێن، بەمەش (پێچە و پەخشە)یەكی (سێ بە سێ) بیمان بۆ دروست دەبێت، چونكە پەیوەندی نێوان هەموو جووت وشەكان بە دوای یەكەوە، پەیوەندییەكی بە یەك گونجاوییە.

**٣ـ (پێچە و پەخشە)ی چواری:**

ـ خۆمن هەمیشە بولبولی حەزم، فەرهاد و مەم و نالی و مەولەوی ئاسا، بە دوای

نازدار حەیرانەکەی شیرین و زین و حەبیبە و خاتوو عەنبەرەوە دەگەڕا...

لە بەشی یەکەمی ئەو پارچە پەخشانەدا، (فەرهاد) و (مەم) و (نالی) و (مەولەوی) هاتوون و وەیەك پێچراون، لە بەشەکەی دواتریشدا هەریەکە و لەو چوار ناوە بۆ خۆشەویستەکانی خۆیان بەڕیز (شیرین) و (زین) و (حەبیبە) و (خاتوو عەنبەر) گەڕێنراونەتەوە.. ئەمەش پێچەوپەخشەیەکی چوار بەچواری بۆ دروست کردووین، کە پەیوەندی نێوان دوو وشەکانی بە یەکەوە، بە پەیوەندییەکی سۆزی (عاتیفی) بەیەکەوە بەستراوە.

بەداخەوە بۆ ئەمە شیعرێکم نەدۆزییەوە، بۆیە ئەو پارچە پەخشانەم هێنا.

**٤ـ (پێچە و پەخشە)ی پێنجی:**

ـ سیاپۆشن لە داخی خەتت و خاڵ و لێوو ڕوو و زوڵفت

وەنەوشەو میسکی چین و ئاوی خزر و لالەو و عەنبەر... مەحوی

لە نیوە دێڕی یەکەمی ئەم دێڕە، شاعیر پێنج وشەی (خەت) و (خاڵ) و (لێو) و (ڕوو) و (زوڵف)ی بە یەك پێچاوەتەوە، پاشانیش لە نیوە دێڕی دووەمدا لە بەرامبەری ئەو وشانە، پێنج وشەی تری (وەنەوشە) و (میسك) و (ئاوی خزر) و (لالە) و (عەنبەر)ی بەڕیز هێناوە، پەیوەندی نێوان هەر یەکە لە (وەنەوشە) و (خەت) ـ (میسك) و (خاڵ) ـ (ئاوی خزر) و (لێو) ـ (لالە) و (ڕوو) ـ (عەنبەر) و (زوڵف) پەیوەندییەکی کێ بڕکێییە، کاتێ هەر یەکە لە وشەکانی نیوە دێڕی دووەم، دەزانن لە جوانیدا ناگەنە وشەکانی بەرامبەریان لە نیوە دێڕی یەکەم، بەمە لەداخان ڕەشپۆش و غەمناك دەبن.

**دووەم:** بەگوێرەی ئەو وشانەی لە بەشی دووەمدا لە بەرامبەر وشەکانی بەشی یەکەم هاتوون، دوو جۆری (پێچە و پەخشە) هەیە:

**١ـ (پێچە و پەخشە)ی ڕێك:** ئەو (پێچە و پەخشە)یەیە، کە وشەکانی ڕیزی دووەمی بەڕێکی لە بەرامبەر وشەکانی بەشی یەکەمی دێن.. بۆ نموونە:

ـ ئەی بوون و نەبوونی نەفەست، مان و نەمانم

بێ نەقدی هەوا، مردن و سەوداتە ژیانم... چروستانی

لە بەشی یەکەمی نیوە دێڕی یەکەمدا، وشەکانی (بوون) و (نەبوون) بە ریز هاتوون و بە یەك پێچراونەتەوە، دوا بە دوای ئەوانیش لە بەشی دووەمدا بەڕێز و لە بەرامبەر وشەکانی بەشی یەکەمی وشەکانی (مان) و (نەمان) هاتوون.. (مان) لە بەرامبەر (بوون) و (نەمان) لە بەرامبەر (نەبوون)، ئەوەش (پێچە و پەخشە)ی ریکە.

ـ منیش وەك ئێوە لە دنیای گەورە گەردێکم بچووك

هەتا ناشتوانم بفڕم بخوێنم بە باڵ بە دەنووك... گۆران

لەم دێڕەدا لە بەشی یەکەمی نیوە دێڕی دووەمدا، رستەکانی (بفڕم) و (بخوێنم) بە پێکەوەپێچراوی هێنراون، دواتر لە بەشی دووەمی هەمان نیوە دێڕدا بە رێکی دوو وشە بۆ ئەم دوو رستەیەی یەکەم پەخشکراونەتەوە، ئەوانیش (بە باڵ) بۆ (بفڕم)، (بە دەنوك) بۆ (بخوێنم)، بەوەش (پێچەوچەخشی رێکی دوویی) دروستبووە.

ـ ئێستێ گیرۆدەی بە دەستی دوژمنم

دێوی شەڕ دیارەو لە بۆیە من ونم... حەسەنی دانیشفەر

لەم دێڕەدا لە سەرەتادا دەبینین دوو وشەکانی (دێوی شەر) و (دیار) هاتوونە، لە دوای ئەوانیش دوو وشەکانی (من) و (ون) هاتوون، (من) لە بەرامبەر (دێوی شەڕ) کە پەیوەندی نێوانیان پەیوەندی کێبڕکێییە، (ون)یش لە بەرامبەر (دیار) کە پەیوەندی نێوانیان (دژیەکی)یە، بەوەش پێچەوچەخشی رێك دروستبووە.

**٢ـ (پێچە و پەخشە)ی ناڕێك:** ئەو (پێچە و پەخشە)یە، کە وشەکانی ریزی دووەمی بە ناڕێکی لە بەرامبەر وشەکانی ریزی یەکەمیدا هاتبن.. بۆ نموونە:

ـ گوتم: ئەی ماه: دڵی من، بە دڵی خۆت بکڕە

گوتی: بەردی بە قیمەت بە کەبابی نادەم... نالی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا، شاعیر (دڵی من) و (دڵی خۆت)ی هێناوە، لە نیوە دێڕی دووەمیشدا دوا بە دوایان وشەکانی (بەردی بەقیمەت) و (کەباب)ی هێناوە.. (بەردی بەقیمەت) لە بەرامبەر (دڵی خۆت) و، (کەباب) لەبەرامبەر (دڵی من)، بەمەش پێچەوپەخشەیەکی ناڕێك دروستبووە.

**٢ ـ پێچە و پەخشی تێکەڵ ـ نادیار ـ**

بریتییە لەو پێچە و پەخشەی، کە کاتێك لە بەشی یەکەمی گوتە دوو شت، یان سێ شت، یان زیاتر دێن و لێکدەپێچرێن، لە بەشی دووەمی گوتەکە، لە بەرامبەر ئەوان بە قەد ژمارەی ئەوان شتی تر دێنەوە، بەڵام دیار نییە، کە کامە شتی بەشی دووەمی گوتە بە روونی بۆ کامە شتی بەشی یەکەم دەگەڕێتەوە، چونکە دەشێت هەریەکە لە وشەکانی بەشی دووەم بۆ هەردوو، یان هەرسێ وشەکانی بەشی یەکەم بگەڕێنەوەو لەگەڵیان هاوپەیوەندی بن.. بۆ نموونە:

ـ وەسمان حەبەش و حەمەشین و ئەحمەدی حاجی

دەم دەم دەوەڕن، وەك سەگ و تولە و تانجی... شێخ رەزای تالەبانی

لەم دێڕەدا لە نیوە دێڕی یەکەمدا وشەکانی (وەسمان حەبەش) و (حەمەشین) و (ئەحمەدی حاجی) بەدوای یەکدا هێنراون و لێکپێچراون، ئەمە (پێچ)ەکەیە، دواتر لە نیوە دێڕی دووەمدا وشەکانی (سەگ) و (تولە) و (تانجی) بۆ ئەم سێ وشانەی سەروو پەخشکراونەتەوە، ئەوەش (پەخش)ەکەیە، بەڵام نادیارییەکی پێوەدیارە، ئاسان نییە بزانرێ، کامەیان لەو سێ وشانەی بەشی دووەم، بۆ کامە لە سێ وشەکانی پێشوو دەگەڕێنەوە، بەوەش (پێچەوپەخشی تێکەڵ ـ نادیار ـ) بەرهەم هاتووە.

**جیاوازی نێوان (بەرامبەری) و (پێچە و پەخشە):**

لە (بەرمبەری)دا، هەمیشە وشە بەرامبەرەکان، ئەگەر چوار بن و ئەگەر شەش و ئەگەر هەر چەندێکیش بن، پەیوەندی نێوانیان، پەیوەندی دژیەکییە، بەڵام لە (پێچەوپەخشە)دا پەیوەندی نێوان دوو بەرامبەرەکان دەشێت پەیوەندی بە دوای یەکدا هاتن، یان بەیەکەوە گونجان، یان لە هەندێ جاردا دژیەکی و هەر پەیوەندییەکی تریش بێت.

**پێچە و پەخشی پڕ:**

ئەو پێچەوپەخشەیە، کە بە دوو هەنگاو تەواو نابێ، هەنگاوی یەکەم پێچ و هەنگاوی دووەم پەخشەکەی بێت، بەڵکو دوای ئەوە لە هەنگاوی سێیەمیشدا ئەم پێچەوپەخشەی یەکەمە هەردووکیان پێکەوە دەپێچرێن و پەخشێکی دیکەیان بەدوادا دێت، واتە

پێچەوپەخشی یەکەم دەبنە پێچ و دواتر پەخشێکی دیکەیان بە دوادا دێت، بەمەش پێچەوپەخشەکە لە ئاسایی دەردەچێت و پڕ دەبێت.. بۆ نموونە:

عەشقان فەرهاد و مەجنون دلبەران شیرین و لەیل

نسبەتەن دیارە کە ئێمەش وەك ئەوانین و لەوین... حەمدی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا سەرەتا وشەکانی (عاشقان) و (فەرهاد) و (شیرین) پێکەوەپێچراون، لە دوایاندا وشەکانی (دلبەران) و (شیرین) و (لەیل)یش بۆیان پەخشکراونەتەوە، ئەم پەخشەش ڕێکەو بە ڕیزە وشە پەخشکراوەکان لە بەرانبەر وشە پێچراوەکان هاتوون، بەڵام دوای ئەوە، وشە پێچراو و پەخشراوەکانی پێشوو بوونەتەوە پێچراو بۆ پەخشێکی دیکە، ئەوەتا لە بەرانبەریاندا، کە بوونەتەوە پێچراو، وشەکانی (ئێمەش) و (ئەوانین) و (لەوانین)دا پەخشکراونەتەوە، (ئێمەش) واتە: (من و تۆی دولبەر) وەکو (عاشق و دولبەر)ەکە وەهاین، (من وەکو فەرهاد و مەجنون)، (تۆ وەکو شیرین و لەیل)، بەوەش پێچە و پەخشی پڕ دروستبووە.

## جوانی بایس:

لە عەرەبیدا (حسن التعلیل)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی ئەدیب بە ئاشکرا، یان بە پۆشراوی هۆی زانراوی شتێك پشت گوێ بخات و بێت هۆیەکی ئەدەبی جوان بۆ شتەکە بێنێتەوە، کە گونجاو بێت لەگەڵ ئەوەی مەبەستیەتی.. واتە ئەو هۆیەی شاعیر بۆ دۆخەکانی دێنێتەوە زادەی خەیاڵی شاعیرانەی خۆیەتی، نەك هەڵقوڵاوی واقیع و ڕاستەقینە.

بە واتایەکی تر: جوانی بایس لێکدانەوەی تایبەت و شاعیریانەی شاعیرە بۆ ئەو بار و دیاردانەی لە سروشت، یان لە دەوروبەری خۆی ڕوودەدەن، بەڵام بێ ئەوەی باس لە هۆیە زانستی و دروستەکەیان بکات، کە لەبەرچی وەهان، چونکە هێنانەوەی هۆی دروست ئیشی زاناکانە، نەك ئیشی شاعیر.. بۆ نموونە:

- ئەی مەهی دوو هەفتە تا شەمس و قەمەر تۆیان نەدی

دانەگیرسان ئەو میسالی ئاگر ئەمیان گڕ نەبوو... حاجی قادری کۆیی

شاعیر لێرەدا ڕوو لە مەهی دوو هەفتە، دەکات (کە مەبەست لە مەهی دوو هەفتە یارە جوان و دڵگیرەکەی خۆیەتی) و دەڵێت هەتا خۆر و مانگ ڕووی جوانی تۆیان نەدی، ئەوان ئاوا دانەگیرسان و تیشکی زێڕین و جوانی خۆیان پەخش نەکرد، واتە بەلای شاعیرەوە هۆی

داتپرسانی خۆر و گرگرتنی مانگ بۆ دەرکەوتنی یارەکەی و کەوتنە بەرچاوی خۆر و مانگ دەگەڕێتەوە، چونکە کە خۆر و مانگ رووی یارەکەی شاعیریان وەها بە درەوشاوەیی و جوانییەوە بینی، ئیرەییان پێ هات و هەوڵیاندا ئەوانیش وەکو ئەم رووی جوانی خۆیان وەدەربخەن. ئەمەش دیارە لێکدانەوەی شاعیرە بۆ بە جوانی دەرکەوتنی خۆر و مانگ، چونکە هۆی دروستی دەرکەوتنی خۆر و مانگ بەو شەوق و جوانی و بەخشینی گەرمییە، ئەوە نییە کە لێرەدا شاعیر دەیڵێ، ئەوانە ئیرەیی بە کەس نابەن و ئیرەیی بردن ئیشی مرۆڤە، نەك هی مانگ و خۆر، بەڵام هۆی دروستی بەو شێوە دەرکەوتنی مانگ و خۆرە، ئەو هۆیەیە کە خودای گەورە کاتێك مەخلوقاتەکانی خۆی خەلقکردووە، ئەو ئەرکەی بە مانگ و خۆر بەخشیوە، ئەوانیش ئەدای ئەرکی خۆیان دەکەن. شاعیر لەم حەقیقەتەی لاداوە، چونکە ئەمە هۆی راستەقینەیە لە لایەن زانایانی ئاین و فەلەکناسییەوە ئەم هۆیە دەخرێتە روو، بەڵام شاعیر ئیشی ئەوە نییە، ئیشی دروستکردنی وێنەی جوان و کاریگەرە، بۆیە وەکو شاعیرێك بە خەیاڵی شاعیرانەی خۆی بەڵگەو هۆکار بۆ دۆخ و دیاردەکان دادەنێ، نەك وەکو زانایان، ئەمەش لێکدانەوەییێکی جوان و دڵگیرە بۆ بابەتەکان و بە (جوانی بایس) دادەنرێت.

ـ لە ئیجلالی گوڵا شەیدایە بولبول دۆستی ئیقبالە
وەك ئەهلی ئێستە ئەلبەتتە بەشی هیجرانە تا مردن... حەمدی

شەیدابوونی بولبول لە لای شاعیر لەبەر جوانی گوڵە، بەڵام نە بولبول شەیدایەو نە جوانی گوڵیش ئەو کاریگەرییەی لەسەر بولبول هەیە، وەکو کەسێك لەسەر کەسێکی دیکە دەشێ بیبێ، چونکە شەیدابوون سیفەتی مرۆڤە دراوەتە بولبول، ئەوەش لێکدانەوەییێکی جوان و دڵگیرە بۆ بابەتەکە و بە (جوانی بایس) دادەنرێت.

ـ عاشقی ڕەنگی خەزانی تۆیە بۆیە دێ بەهار
فەسڵی هاوین گەرمی مەیلی بەفرەکەی زستانتە... حەمدی

شاعیر روو لە یارەکەی دەکات و پێی دەڵێت: بەهار لە بەر خەزانی کوردستان نایێ، هەر لەبەرئەوە دێ، چونکە عاشقی تۆیە! ئەمەش لێکدانەوەییێکی جوان و دڵگیرە بۆ بابەتەکە و (جوانی بایس)ە، دەنا لە راستەقینەدا شتی وەها دروست نییە.

ـ هەنگامی وەصڵە شەستپەڕ و مینا بە یەك ئەگەن
پەردەی زەفافە قەوس و قەزەح ڕاکشایەوە... حەمدی
شاعیر لێرەدا دەڵێ: لەبەر وەصڵ و بەیەکگەیشتنی شەستپەڕ و مینا پەلکەزێڕینە وەکو پەردەی زەفاف باڵیکێشاوە، ئەمەش لێکدانەوەییێکی جوان و دڵگیرە بۆ بابەتەکە و (جوانی بایس)ە، دەنا دروستبوونی پەڵکەزێڕینە بە هۆی فەلەکی دروست دەبێت، لە دوای بارانی بەهاران کە تیشکی خۆر دەردەکەوێ، ئەو تیشکە ناتوانێ وەکو هەمیشە ئاسایی بێت، بۆیە ڕەنگ لە سروشت وەردەگرێت و دروست دەبێ.

ـ خوێنی ئەمەندە گەرمە گوڵی ئاتەشی سەحەر
لــــــــــــــــوئلوئی شەونمی لە مەراقا توایەوە... حەمدی
شاعیر لەم دێڕەیدا دەڵێت: گوڵی بەرەبەیان هێندە خوێنگەرمە، بە هۆی ئەو گەرمییەوە شەونم مەراق دەکات و دەتوێتەوە! ئەمەش لێکدانەوەی جوان و دڵگیری شاعیرانەیە، دەنا توانەوەی شەونم پەیوەندی بە خوێنگەرمی چ گوڵێکەوە نییە، هۆیەکە دەرکەوتنی خۆر و بڵاوبوونەوەی تیشکە بەهێزەکانیەتی، بەوە شەونم دەمی بەسەر دەچێت، بەرگەی خۆرەکە ناگرێت و لە گوڵەکە جیادەبێتەوە، جا دەبێتە هەڵم، یا دەکەوێتە خوارەوە، بۆیە هۆکەی شاعیر بۆ توانەوەی شەونمی داناوە، (جوانی بایس)ە.

ـ لە بەرقی ڕەنگی شەرواڵی حەیا دامێنی هەڵماڵێ
لە تەقەی دەنگی خلْخاڵی لە گەردوون زوهرە داماوە... حاجی قادری کۆیی
لە نیوە دێڕی دووەمدا شاعیر دەڵێت: ئەستێرەی زوهرە لە ئاسمانەوە بۆیە داماوە، چونکە گوێبیسی دەنگی خۆشی خڕخاڵەکانی یار بووە لەسەر زەوی، ئەدی ئەگەر دەنگی خڕخاڵەکان وەها خۆش و وروژێنەر و کاریگەربن و لەو دوورەوە زوهرە داماو بکەن، دەبێ حاڵی منی نزیك بە گوێبیستبوونی ئەم دەنگە خۆشە چی لێبێت و چیم بەسەر بێ؟ بەڵام ئەمە لە ڕاستیدا لێکدانەوەی شاعیرانەیە، چونکە لەلایێك زوهرە داماو نییە، چونکە داماوی بۆ مرۆڤە نەك بۆ ئەستێرە و ئاسمان و خۆر و مانگ، لەولاشەوە ئەگەر هات و زوهرە داماویش بێ، لەبەر دەنگێ خلْخاڵی یارەکەی شاعیر نییە، چونکە زوهرە ئەستێرەیە و لەم دەنگ و ئاوازانە ناگات و پێیان

وروژاوو کارتێکراو نابێ. ئەمەش لێکدانەوەییێکی جوان و دڵگیرە بۆ بابەتەکەو بە (جوانی بایس) دادەنرێت.

ـ داغداری ڕوخییە لالەیی حەمرا لە چەمەن

نەرگسە چاو لەبەری غەمزەیی غەممازی ئەوە... حاجی قادری کۆیی

شاعیر لەم دێڕەدا لە نیوە دێڕی یەکەمیدا دەڵێ: دەڵێ لالەی حەمرا بۆیە وەهایە، چونکە داغداری روومەتی جوانی ئەوەو ناتوانێ وەکو ئەو وەها جوان و سوور بێ، بۆیە وەها بە داغەوە ماوەتەوە، بەڵام لە راستیدا ئەمە لێکدانەوەی شاعیرانەیە، دەنا نە لالەی سوور ئاگای لە رومەتی یارەو نە دەشتوانێ ئیرەیی بە یەکێك ببات و بە هۆیەوەی داغدار بێ، ئەوانە خەیاڵێ شاعیرانە دروستیان کردووەو لێکدانەوەی جوان و دڵگیرن بۆ بابەتەکان و بە (جوانی بایس) دادەنرێت.

لە نیوە دێڕی دووەمیشیدا شاعیر دەڵێ: نەرگس بۆیە وەها سەری شۆڕکردۆتەوە، ئەوە چونکە چاولەبەری هاتنی یارەو غەمزەیی غەممازی دەکات، ئەوەش دیسانەوە هۆی وەها وەستان و دەرکەوتنی گوڵە نێرگس ئەوە نییە، کە شاعیر بۆی دادەنێت، چونکە ئەوەی شاعیر گووتوویەتی ئەوە لە پسپۆڕی مرۆڤەو گوڵ وەکو مرۆڤێك مامەڵە ناکات، تا وەها بکات، بۆیەشە ئەمە (جوانی بایس)ەو بۆ جەمالییەتی دەربڕینی ئەدەبی پەنای بۆ براوە.

ـ گەر بە ئومێدی ویصاڵی شامی زلفی تۆ نەبێ

سەر لە کەل دەرنایەنێ هەر نایەوێ ئەو مانە ڕۆژ... حەمدی

شاعیر روو لە یار دەکات و دەڵێت: لەبر خاتری تۆیە رۆژ حەزی لە ژیانە و درێژە بە تەمنی خۆی دەدات، دەنا ئەگەر لەبەر تۆ نەبێ، ئەو تاقەتی ژیانی نەماوەو جارێکی دیکە سەردەرنایێنێ! بەڵام ئەمە لێکدانەوەی شاعیرانەیە، دەنا هاتن و ونبوونی رۆژ لەبەر بێتاقەتبوون و ژیانی کەس نییە، بەڵکو ئەمە سووڕی ژیانی رۆژ خۆی وەهایەو خودای گەورە کە زەوی و مەخلوقات و ئەستێرە و مانگەکانی دروست کردووە، هەریەکەو ئەرکێکی پێسپاردوون بۆ ئەوەی ژیان بەردەوام بێ، خۆریش ئەوەی پێسپێردراوە، کە بە تیشکە زێڕینەکانی خزمەتی خەڵك و خاك و هەموو کونجێکی گەردوون بکات، ئیتر بەردەوام لە سووڕانەوەیەو بەوە بۆ چەند کاتژمێرێك لە هەر شوێنێکە و دوای ئەوە بۆ چەند کاتژمێرێك ئاوا دەبێ و دەگاتە شوێنانێکی تر و پاش چەند کاتژمێرێك دیسانەوە دێتەوە شوێنی پێشووی و

بەم شێوەیە تا ژیان لەسەر پشتی ئەم زەمینە بمێنێ، ڕۆژیش خەریکی ئەم ئەرکەی خۆی دەبێ، بەڵام لەبەر خاتری فلاّن و فیسار حەز لە ژیان کردن، ئەوە کارێکی بچووکی هەندێ کەسە، نەك کی هەموو خەڵکیش، چونکە ئادەمیزاد لەبەر هۆی گەورە و لەبەر ئەو ئەرکە گەورەی لەسەرشانیەتی حەز لە مانەوەی لەسەر زەوی دەکات و دەکۆشێ و دەبەخشێ، نەك لەبەر خاتری فلاّنێك، با ئەو لاّنە هەر کێش بیت، بەڵام دەشێ عاشقێك لە باری شەیدابوونێکی گەورەی بۆ یارەکەی خۆی وایلێبێ ڕۆمانسییانە بیربکاتەوەو لە کاتێ لە کاتەکاندا بۆ خۆبردنە پێشی زیاتری لە یارەکەی ئەو قسەیەی ئاراستە بکات، بەڵام ئەوەش قەت بۆ ڕۆژ دروست نییە، بۆیە ئەمەی شاعیر دەیڵێ، لێکدانەوەییێکی جوان و دڵگیری خۆیەتی، وەکو شاعیرێك بۆ دەرخستنی سەرسامی خۆی بە یارەکەی ئەوەی بۆ گوتووە، بەوەش هونەری (جوانی بایس)ی بەرهەمهێناوە.

ـ هەر لە ئاوابوونی ڕۆژانایە ماتەم دەیگرێ

عەرزی ئەندامی دەکا دیارە لە ڕەشپۆشانە شەو... حەمدی

شاعیر لێرەدا دەڵێ: لەبەر ئاوابوونی ڕۆژ شەو خەمبار و ماتەمدار دەبێ و جلی ڕەش دەپۆشێ، دیارە ئەوەش هۆکاری ڕەش دەرکەوتنی شەو نییە، ئەمە خەیاڵی شاعیرانەیە و (جوانی بایس)ە، چونکە ماتەم گرتن بۆ مەرگی ئازیز کاری مرۆڤە، نەك هی شەو، کە شەو هەست و سۆزی نییە و ئەقڵ و فیکری نییە، بتوانێ وەکو مرۆڤێك بیربکاتەوە.

ـ خەرامان لە دەوری گوڵستان چنار

خەریکن دەکەن مەشقی بالاّی یار... حەمدی

مانگی خەرامان بای دێت و دار چنارەکانی دەوری گوڵستان دەهەژێنێ، ئەمە هۆی ڕاستەقینەی جولانی دار چنارەکانە، بەڵام شاعیر کە ئەو وێنەیە لە شیعری خۆیدا تەوزیف دەکات، ئەو وەکو جووتیارێك قسە ناکات، تا بێت ئەو ڕاستییە تۆمار بکات، بەڵکو وەکو شاعیرێك بە شێوازی تایبەت و شاعیریانەی خۆی گوزارشتی لێدەکات و وای پیشان دەدات، لەبەر مەشقی بالاّی یار وەهان، ئەمەش (جوانی بایس)ەو واقیع نییە.

ـ لە دنیادا سەری موو غەم نەماوە

لە دەورەم گردە بۆیە میسلّی کێوم... حەمدی

شاعیر لە موبالەغەییێکیدا دەڵێت: من بۆیە بە قەد کێوێك گەورەم، چونکە غەم بە قەد سەری موویێك لە دونیا نەماوەو هەمووی هاتووە لە دەوری من کۆبووەتەوە، ئەوە وایکردووە من بەو شێوەیە گەورە بم! بەڵام ئەمە لێکدانەوەی شاعیرانەیە، دەنا شتی وەها راست نییە و ئەگەر شاعیر کەمێکیش قەڵە و بێت، ئەوە لەبەر ئەوەیە شتی زۆر خواردووەو گۆشتی زۆری گرتووە، نەك لەبەر ئەوەی غەمی دونیا بەسەریاندا دابێت و بەم هۆیەوە گەورەبووبێت! ئەوە (جوانی بایس)ە.

ـ شەو وتی ئەولادی رۆژم رووڕەشی بۆ مایەوە

نووری وەششەمسی لە وللەیلا نەدی، کەس ئاشکار... حەمدی

شەو تاریکە، هۆکەش ئەوەیە خۆر ونە، هەر کاتێك خۆر دەرکەوتەوە، شەو بەسەردەچێ و ئیتر تاریکی تا ئاوابوونێکی دیکە ناگەڕێتەوە، ئەمە هۆی راستەقینەی تاریکی شەوە، کەچی شاعیر کە باس لە تاریکی شەو دەکات، وەکو شاعیرێك بە شێواز و خەیاڵی شاعیرانە مامەڵە لەگەڵ ئەو دیمەنە دەکات و دەڵێت: ئەوە لەبەر ئەوەیە درۆی کردووەو گوتوویەتی ئەولادی خۆرم، ئەوەش راست نییە و مایەی شەرمەزارییە بۆیە رووی رەش هەڵگەڕاوەو وەهای بەسەر هاتووە، بەڵام ئەمەش لێکدانەوەی خەیاڵی جوان و دڵگیری شاعیرانەیە بۆ بابەتەکە و (جوانی بایس)ە، دەنا شەو ئادەمیزاد نییە ئاخاوتن بکات و راستی و درۆ لە قسەکانی بکەوێت!

ـ لە داخی بەفر و زستان و کرێوە

چیای ڕازاندبۆوە خاکە لێوە... هێدی

(خاکە لێوە) چیای رازاندۆتەوە، ئەوەش بە لێکدانەوەی شاعیر بەو هۆیەوەیە، کە ئەو رقی زۆری لە (بەفر و زستان و کرێوە) بووە، بۆیە وەها بە باڵای چیادا هاتۆتە خوارو سەرەوخواری رازاندۆتەوە، بەڵام لە راستیدا ئەوە هۆی دروست نییە، بەڵکو هۆی دروستی رازاندنەوەی چیا لەو کاتەداو بەم شێوەیە، بە هۆی سروشتییە، کە شاعیر ئەو هۆیە سروشتیەی بەلاوە گرنگ نییە، ئەو دەیەوێت دەقێکی ئەدەبی دروست بکات و جوانییەکی دیکەی زادەی خەیاڵی

شاعیرانەی بە دەقەکەی بدات، بۆیە بەم شێوەیە بەڵگە بۆ ئەو دۆخە دادەنێت، ئەمەش لای زانایانی رەوانبێژی (جوانی بایس)ی پێدەگوترێت.



**بادانەوە:**

عەرەب (رجوع) و (مغایره)یان بۆ بەکارهێناوە، بەڵام (مغایره) جیایە، ئەبی هیلالی عەسکەری گوتوویەتی: ئەوەیە باسی شتێك بکات، دواتر لێی باداتەوە.. کوردیش (بادانەوە)یان پێ گوتووە، گوتوویانە: بریتییە لەوەی، کە لە پێشدا قسەیەك بکەیت و بە دوای قسەکردنەکە راستەوخۆ نکۆلی و لالوتی لە قسەکە بکەیت، شتەکە بە جۆرێکی تر هەڵبگێڕیتەوە. یانیش هەر (رجوع)ەکەیان بۆ بەکارهێناوە، بۆ نموونە مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس هەر (رجوع)ی بەکارهێناوەو گوتوویەتی: ئەوەیە وتارێ بڵێیت و پاشان بگەڕێیەوە سەری بە معارەزە.

کەواشبێ قسەکردن و پەشیمان بوونەوە لێی بۆ ئەوەی شتێکی پێچەوانە بڵێیت، ئەمە راگۆڕین و بادانەوەیەو شێوازێکی دەربڕینە، لەبەر گەلێ هۆ دەکەوێتە نێو شیعریش، جا لە دێڕێکدا بەرجەستە بێت، یان لە دوو دێڕی هاوشێوەدا.. بۆ نموونە:

ـ ئەوا لە دووره و پەیابوو جوانێ

مەڵێ جوان، بڵێ مانگی تابانێ... ئەحمەدی موفتی زادە

سەرەتا شاعیر وەسفی دەرکەوتنی کەسێك دەکات (مەبەست پێغەمبەرە ـ درود و سڵاوی خوای لەسەر ـ)، بە جوان ناوی دەبا، دواتر لەو وەسفەی بادەداتەوەو دەڵێ: نا وەهای وەسف مەکە، بەڵکو بڵێ مانگی تابان بوو هات، کە ئەمە واتە هێندە جوان بوو، وەسف ناکرێ، ئیدی چۆن بڵێین جوان بوو و بەس؟!

ـ گەرچی تا ئێستا گوتوومە: تێبگەن، زوو پێبگەن

بەم قسانەم ئێوە قەت باوەڕ مەکەن، سەگ بووم وەڕیم... بێکەس

لە نیوە دێڕی یەکەم داوای تێگەیشتن و پێگەیشتنی کردووە، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم لەوە پەشیمان بووەتەوەو بایداوەتەوە.

جوانی ئەم هونەرە
بادانەوە هونەرێکی قەشەنگی جوانکارییە، جوانییەکەی لەوەدایە شاعیر بە ئاشکرا، یان بە نائاشکرا شتێك دەزانێت و دواتر لێی لادەدات، یانیش شتێك دەڵێت زۆر پێی پشت ئەستوورەو بە دڵنیاییەوە دەیڵێت، لە پاشان زوو ترسی پێچەوانە و لێتێکچوونی بۆ دروست دەبێت، بۆیە بە زوویی پەشیمان دەبێتەوەو رای خۆی دەگۆڕێت.

## جۆرەکانی بادانەوە:

بە پێی ئەو مەودایەی (بادانەوە)ی تیا ئەنجام دەدرێ، دوو جۆری (بادانەوە) هەیە، بریتینە لە:

### ١ـ بادانەوە لە سنووری تاکەدێڕ

ـ بە بە بادی سەرسەڕی سەردی ئەوت من ناشکێم ئەما
برا پشتی شکاندووم بێکەسی بەستوویەتی باڵم... حەمدی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا قسەکەر گوتوویەتی من ناشکێم، ئەوەش بڕیارێکی گشتییە، لە پاشان گوتوویەتی: برا پشتی شکاندووم! دیارە ئەوەش (بادانەوە)یە، چونکە شکان بە هۆی مردنی برا، یان ونبوونی، یان بە هەر هۆیەکی دیکەش بێ، هەر شکانە، ئەوەی نەشکێ، بە هیچ هۆیەك لەم هۆیانە نابێ بشکێ.

### ٢ـ بادانەوە لە دوو باری لێکجیا

جاری وەها هەیە شاعیر لە هۆنراوەییێکیدا، کە لە بارێکی دیاریکراو گوتوویەتی، شتێکی گوتووەو لە بار و هۆنراوەییێکی تر پێچەوانەی گوتووە.. بۆ نموونە: حاجی قادری کۆیی لە دوو بەیتیدا کە بەراوردی نێوان خۆی و نالی دەکات لە رووی داهێنانی شیعرییەوە، خۆی زۆر بچووك پیشان دەدات و دەڵێت: ئەوا دێڕێکی نالی بە شیعرەکەی خۆم تێکەڵدەکەم، بۆ ئەوەی بزانن من قەت وەکو ئەو نابم، دەنووسێت:

بە تەزمین فەردەکی نالی دەهێنم تا ڕەفیقانم
بزانن فەرقمان زۆرە خەزەف قەت وەك گەوهەر نابێ
(کەمەندی زولفی دوو لانە، لە بۆ گەبر و موسڵمانە

دەكێشێ بێ موحابانە، چ لەم لا بێ، چ لەولا بێ)... حاجی قادری كۆیی
بەڵام هەر حاجی لە شوێنێكی تردا لەم رایەی دەگۆڕێت و بادەداتەوە دەڵێت:
ـ بەجێ ما (نالی) وەك (ناڵی)، بە پاش كەوت كوردی وەك گەردی
كە حاجی غاری دا ئەسپی لە مەیدانی سوخەندانی... حاجی قادری كۆیی

(حەمدی)ش هەمان شێوازی هەیە، بۆ نموونە لە دێڕێكیدا گوتوویەتی:
من غولامی تۆم تەنەززوول قەت دەكەم بۆ تەخت و تاج
بێ سولەیمانی دەكا هودهود بە تاجی ئیحتیياج... حەمدی
لە نیوە دێڕی یەكەمدا شاعیر بەم پرسیارەی مەبەستی ئەوەیە بڵێ: ئەی یار! من مادام غولامی تۆمە قەت بۆ تەخت و تاج تەنازوول ناكەم، ئەمە هەواڵێكە بە (قەت) نەفیكراوەو بە (دەكەم)ی رانەبردوو لە نێو رستەییێكی پرسدا بەستراوەتەوە، ئەوەش كەواتە بەردەوامی هەیە و قەت تەنازوول بۆ تەخت و تاج ناكات، بەڵام هەرزوو دەترسێ ئەو غولامییەی نەمێنێ، بۆیە رای دەگۆڕێ و دەڵێ: بەڵام بۆ نا خۆ ئەگەر سولەیمان نەما، ئەوا هودهود ناچارە پەنا بۆ (تاجی)ش ببات! واتە، بەڵام بۆ نا؟! خۆ ئەگەر تۆ نەمای، ئەوا دوورنییە ناچاربم تەنازوول بكەم و چۆن هودهود بە هۆی سولەیمان پێغەمبەرەوە (درود و سڵاوی خوای لەسەر) پشت ئەستوور بوو، دواتر كە ئەو نەما ناچار بوو پەنا بۆ تاجی ببات، دەشێ منیش تۆم نەمێنێ تەنازوول بۆ هەریەكێكی زۆر كەمیش بكەم! ئەمەش بادانەوەیە لە بریارێك كە پێشتر داویەتی.

### كۆكردنەوە:

(كۆكردنەوە) لە عەرەبیدا (الجمع)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە كۆكردنەوەی دوو شت، یان زیاتر لە ژێر بەیداخی بریارێكەوە.. بۆ وێنە:
ـ پشتیوانی، بینایی، شەرعی مەتین
شیرو، بەخشین و، خامەیی ڕەنگین
بەو شەشە دین موحافەزە دەكرێ
یەكێ مرد لەو شەشانە، دین دەمرێ... حاجی قادری كۆیی
لە دێڕی یەكەمدا، شاعیر هاتووە شەش شتی كۆكردۆتەوەو بە دوای یەكیدا ریز كردوون، كە بریتین لە: (پشتیوانی ـ بینایی ـ شەرعی مەتین ـ شیر ـ بەخشین ـ خامەی رەنگین)، هەر

هەموویانی لەژێر بەیداخی ئەو بڕیارەدا کۆکردۆتەوە، کە لە دێڕی دووەمدا بەسەریاندا دەبڕێ، تیایدا دەڵێت: (بەو شەشە دین موحافەزە دەکرێ)، ئەگینا هەر یەکە لەو شەشانە لە ئەوانی تر دابڕێنرا، ئەوا دینیش دەکەوتە مەترسی و لە ژیان دادەبڕێ.

جاری واش هەیە، کە شاعیر دوو سیفەت یان زیاتر لەگەڵ یەك کۆدەکاتەوە، دەیانهێنێ پەسنی شتێکیان پێدەدات، کە ئەمە لای ڕەوانبێژان کەمتر باسی لێوەکراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی چەند شتێك بۆ پەسنی یەك شت بەدوای یەکدا کۆدەکرێنەوە، لەو بڕوایەدام، ناکرێ فەرامۆش بکرێت و ئاماژەی پێنەدرێت، بۆ وێنە:

کوردی ئێمە نەزان و پاشکەوتن

پێکەوە پووش و ئاگر و نەوتن... حاجی قادری کۆیی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا شاعیر سەرەتا باسی لە (کورد) کردووە، ئینجا لە دوای ئەوە بە دوو سیفەتی (نەزان)ی و، (پاشکەوتن)ی کە بەدوای یەکی کۆکردوونەتەوە پەسنی ئەو (کورد)ەی داوە، لە نیوە دێڕی دووەمیش هەر بۆ پەسنی (کورد) سێ سیفەتی تر لە دوای یەك کۆدەکاتەوە، کە کاتێ لەگەڵ یەکن ئەم کوردانە وەك (پووش و ئاگر و نەوت) وان و ناتەباو دژ بەیەکن، ئەوەش جۆرێکی تری (کۆکردنەوە)یە.

**جۆرەکانی (کۆکردنەوە):**

بە گوێرەی ئەو وشانەی بە هۆیانەوە (کۆکردنەوە)کە ئەنجام دەدرێت، دەشێ ئەم جۆرانەی (کۆکردنەوە) هەبن:

**١ـ دەشێ (کۆکردنەوە) لە نێوان دوو (ناو)یان زیاتر بێت، بۆ وێنە:**

ـ گوڕەی بەهارییە ئێستێکە شاخ و داخی وڵات

پڕە لە لالەوو نەسرین و نەرگسی شەهلا... حاجی قادری کۆیی

(لالە) و (نەسرین) و (نەرگسی شەهلا) هەر سێکیان (ناو)ن و کۆکراونەتەوە.

ـ قەومەکان بەو زاتە وا حوکمی لە سەر بەحڕ و بەڕە

بەرخە نێرێ گەر نەنێرێ، هەر کەسێ صاحێب مەڕە

دێم بە گژیا، دەیدڕم، گەر (في المثل) شێری نەڕە

بانەقەومێت و نەزانن، ئەو هەموو شۆڕ و شەڕە

دەست لەسەر بزنی شەل و کاوڕی گەڕ و بەرخی لەڕە.. شێخ ڕەزا

(بزنی شەل) و (کاوڕی گەڕ) و (بەرخی لەڕ) سێ ناوی لێکدراون، کۆکراونەتەوە لە ژێر بەیداخی هۆیەکانی ئەو هەموو شۆڕ و شەڕەی، شاعیر لە دروستبوونیان دەترسێت.

**٢- دەشێ (کۆکردنەوە) لە نێوان دوو (ڕاناو) بێت.. بۆ وێنە:**

ـ ئەی مانگ من و تۆ هەردوو هاودەردین

هەردوو گرفتار یەك ئاهی سەردین... بێکەس

(من) و (تۆ) دوو ڕاناوی کەسی سەربەخۆن لەژێر بڕیاری هاودەردی کۆکراونەتەوە.

**٣- کۆکردنەوەی ئاوەڵناو**

ـ ئەمانە زادەیی ئەفکارِ و خۆشەویستی منن

ئەگەر قەبیح و کەریهن، ئەگەر شەل و ئەعما... حاجی قادری کۆیی

(قەبیح) و (کەریه) و (شەل) و (ئەعما) هەر چواریان (ئاوەڵناو)ن و کۆکراونەتەوە.

**٤- دەشێ (کۆکردنەوە) لە نێوان کۆمەڵێ وشەی پەسن لێکجیابێت.. بۆ وێنە:**

ـ کپی و ناڵین و سکاڵاو زاری

پەستی و بێزاری، دەردی بێکاری

کزی باوەڕ و سستی ئەنوێنن

تای تین و وزەی گیان ئەپسێنن... جەمال بێدار

لە دێڕی یەکەمدا دەبینین: وشەکانی (کپی)و (ناڵین)و (سکاڵا و زاری) و (پەستی) و (بێزاری) و (دەردی بێکاری) هەر شەشیان لەگەڵ یەکدا لە ژێر بڕیاری کزی باوەڕ و سستی نواندن کۆکراونەتەوە.. وشەکانی (کپی) و (پەستی) و (بێزاری) ناوی سادەی واتایین.. (سکاڵا و زاری)و (دەردی بێکاری) هەردووکیان ناوی لێکدراون، (ناڵین) چاوگەو وەك و ناو بەکارهاتووە.

**٥ـ کۆکردنەوەی دەستەواژە.. جاری وا هەیە دوو یان زیاتر لە دوو دەستەواژە پێکەوە لەژێر خاسەویژێك کۆدەکرێنەوە.. بۆ نموونە:**

ـ دوعای نیوە شەو و ناڵەی سەحەرگاه نەبووە تەئسیری

به ئومێدی ویصاڵی تۆ ئەمانە حەمدی تەی ناکا... حەمدی

(دوعای نیوە شەو) و (ناڵەی سەحەرگاه) هەردووکیان (دەستەواژەن) و کۆکراونەتەوە.

**٦ـ دەشێ (کۆکردنەوە) لە نێوان دوو (رستە) یان زیاتر بێت.. بۆ وێنە:**

ـ وەك تریشقە ئاگر دەگرن، هەوری ڕەحمەت ناگرن

ئەژدەها دەگرن بە قەد دێویك و عیبرەت ناگرن... حەمدی

ئەم دێڕە چوار رستەی بە دوای یەکی لە ژێر پەسنی (ئەوان)دا کۆکردۆتەوە، کە بریتینە لە رستەکانی: (وەك تریشقە ئاگر دەگرن)، (هەوری ڕەحمەت ناگرن)، (ئەژدەها دەگرن بە قەد دێویك) و (عیبرەت ناگرن).

ـ خەوم بێهۆشی یە، بەرگم پەلاشە

خۆراکم خوێنە، شادیم شینە، بێ تۆ.. کوردی

(خەوم بێهۆشی یە)، (بەرگم پەلاشە)، (خۆراکم خوێنە)، (شادیم شینە) هەر چواریان رستەن و لەژێر (بێ تۆ)ییدا کۆکراونەتەوە.

**لێککردنەوە:**

(لێککردنەوە) لە عەرەبیدا (التفریق)ی پێدەگوترێت.. بە تەواوی پێچەوانەی کۆکردنەوەیە.. لە (کۆکردنەوە)دا دوو شت، یان پتر، لە فرمانێك یان خاسە ویژێك و (بڕیارێك) کۆدەکرێنەوە، کەچی لێرەدا دوو شت یان زیاتر کە پێکەوە دێن، لێکدەکرێنەوەو جیاوازی نێوانیان دەخرێتەڕوو.. بۆ وێنە:

ـ دڵی شاد ئاگای لە شێواو نییە

لەش ساغ خەبەری لەداماو نییە

سوچی کەس نییە، هەروەها بووە

ئازاد کوا ئاگای لە گیراو نییە؟.. باباتاهیری عوریان

لەم چوارینەدا، شاعیر (دڵی شاد) و (دڵی شێواو)ی لێککردۆتەوە.. لە نیوە دێڕی دووەمدا (لەش ساغ) و (داماو)ی لێککردۆتەوە.. لە نیوە دێڕی چوارەمیشدا پیاوی (ئازاد) و پیاوی (گیراو)ی دیسانەوە لێککردۆتەوە.

ـ داری دنیا هەر کەسێکی تێگەیی

میوەیی خامی هەیە و میوەی گەیی... حاجی قادری کۆیی

دوو میوەی داری دنیا لێکتری جیاکراونەتەوە، یەکیان (خاو)ەو ئەوی تریان (گەییو)، بەوەش (لێککردنەوە) دروستبووە.

**دابەشکردن:**

(دابەشکردن) لە عەرەبیدا (التقسیم)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە سەرەتا باسکردنی چەند شتێك، لە دواتریش بە جیا بۆ هەر شتەی شتی تر زیاد بکەیت.. بۆ وێنە:

ـ ئەگەر تۆ هیوات بە بەگ و خانە

تۆ ماڵوێران و ئەو سەرگەردانە... موفتی پێنجوینی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا، شاعیر وشەکانی (تۆ) و (بەگ و خان)ی هێناوە، لە نیوە دێڕی دووەمیشدا بۆ هەر یەکەیان بە جیا، شتی تری زیاد کردووە.. بۆ (تۆ) ماڵوێرانی و بۆ (بەگ و خان)یش سەرگەردانی، کە بە (ئەو)ی ڕانای سەربەخۆی کەسی سێیەمی تاك ئاماژەی بۆ (بەگ و خان)ەکە کردووە، ئەمەش ئەوە دەگەینێ کە مەبەستی لە (بەگ و خان) یەك شتە، نەك دوو شتی لەیەك جیا، لەوەشدا (دابەشکردن) بەرجەستە بووە.

نموونەیەکی تر لەم بارەیەوە، لەو دێڕەی خوارەوە بەرجەستە دەبێت، کە تیایدا شاعیر دەڵێت:

ـ لەگەڵ دڵ شەرتی من وایە، هەتا ڕۆژێ حەیاتم بێ

بەشی ئەو دەرد و غەم بێت و منیش ماتەم خەلاتم بێ... ئەحمەد موختار جاف

لە نیوە دێڕی یەکەمدا، دەبینین شاعیر وشەکانی (دڵ) و (من)ی هێناوە، دواتریش لە نیوە دێڕی دووەمدا، بۆ هەر یەکەیان بەجیا شتێکی زیادکردووە، (دەرد و غەم) بۆ (دڵ) کە بە (ئەو)ی ڕاناوی سەربەخۆی کەسی سێیەمی تاك ئاماژەی بۆ کردووە، (ماتەم)یش بۆ (من)، بەمەش نموونەیەکی (دابەشکردن)مان بۆ بەرجەستە بووە.

ـ هەرچی تۆ بێژی گشت قەبووڵمانە

لە ئێمە دەرد و لە تۆ دەرمانە... ئەحمەدی موفتی زادە

دەرد بۆ ئێمە و دەرمان بۆ تۆ دابەشکراون.

## کۆکردنەوە لەگەڵ لێککردنەوە:

(کۆکردنەوە لەگەڵ لێککردنەوە) لەعەرەبیدا (الجمع مع التفریق)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو شت یان زیاتر لەژێر دەواری بڕیارێك یان خاسەویژێکدا، لەپاشان جیابکرێنەوە لەو هۆیەی کە یەکی خستوون.. بۆ وێنە:

ـ دڵی زارم وەکو ئاگر بە دایم کاری سووتانە

کەچی ڕووی یار وەك و ئاگر، هەمووده‌م وابە تابانە... زێوەر

لێرەدا شاعیر دڵی خۆی و روومەتی یاری بە ئاگر چواندووە، لە پاشان جیایانی کردۆتەوە، بەوەی کە لێکچوونەکە لە روومەتی یارا شەوق و بریسکەکەیەو لەدڵی خۆیشیدا کڵپە و بڵێسەکەیە.

## کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن:

(کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن) لە عەرەبیدا (الجمع مع التقسیم)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە کۆکردنەوەی دوو شت یان زیاتر لەژێر دەواری بڕیارێك یان خاسە ویژێك، دواتریش بە جیا بۆ هەر شتەیان شتی تر زیاد بکرێت، بۆ وێنە:

ـ بە جووت پەروانەو و ماسی، کە دڵدادەی چراو گۆڵن

نزیکی ئەم ئەسووتێنیٚ، لە دووری ئاو ئەوان حۆڵن... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی یەکەم باس لە (پەروانە) و (ماسی) کراوە، کە یەکەمیان حەزی بە (چرا)و دووەمیان حەزی بە (گۆڵ)ە، ئەمە کۆکردنەوەیە، دواتر بۆ یەکەمیان کە (پەروانە)یە ئەوە زیادکراوە، کە ئەگەر لە (چرا)کە زۆر نزیك بێتەوە دەسووتێت، بۆ دووەمیش کە (ماسی)یە ئەوە زیاد کراوە، کە ئەگەر لە (گۆڵ) دوور بێت (حۆڵ) دەبێت، بەمە کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن بەرهەم هاتووە.

ـ قەڵەم من و تۆ و ژیان مەزلومین

هەرسیٚ وێنەی یەك بەندومەحکوومین

من مەحکوومی چەرخ، تۆ مەحکوومی من

ژیان گیرۆدەی دۆستی دڵ دوژمن... قانیع

لە نیوە دێڕی یەکەمدا، سەرەتا کە شاعیر روو لە (قەڵەم) دەکات، سیٚ شت بە دوای

ئەدادێنێت، کە (من) و (تۆ) و (ژیان)ن و لە ژێر دەواری (مەزلومین)دا کۆیان دەکاتەوە، ئەمەش (کۆکردنەوە)یە.. ئینجا لە پاش ئەوە دێت بەجیا بۆ هەر یەکە لەو سێ شتانە شتی تر زیاد دەکات، بە وێنەی (مەحکوومی چەرخ) بۆ (من).. (مەحکوومی من) بۆ (تۆ).. (گیرۆدەی دۆستی دڵ دوژمن) بۆ (ژیان) ئەوەش (دابەشکردن)ە، بەم شێوەش لەو پارچەیەی سەروو، نموونەیەکی (کۆکردنەوە لەگەڵ دابەشکردن) بەرجەستەبوو.

## (لێککردنەوە) لەگەڵ (دابەشکردن):

(لێککردنەوە لەگەڵ دابەشکردن) عەرەبییەکەی دەبێتە (التفريق مع التقسيم)، هەرچەندە لەو سەرچاوە عەرەبییانەی من بەرچاوم کەوتووە، نەم بینیوە رەوانبێژانی عەرەب ئاماژەیان بە هونەرێکی وەك ئەوە بەم ناوەکردبێ، هەروەها رەوانبێژانی کوردیش ئاماژەیان بۆ نەکردووە.. بریتییە لەوەی لە نیوە دێڕی یەکەمدا دوو شت لێکبکرێنەوە، ئینجا دواتر لە نیوە دێڕەکەی تردا بەجیا بۆ هەریەکە لەشتە لێککراوەکان شتی دی زیاد بکرێت..بۆ وێنە:

- بەیەك ناچن ڕەقیب و حاجی قادر

خودایە ئەو ڕەزیل کەو، ئەم موکەڕڕەم... حاجی قادری کۆیی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا دەبینین، شاعیر لە لێکنەچووندا (رەقیب) و (حاجی قادر)ی لێککردۆتەوە، ئەمەش (لێککردنەوە)یە.. لە نیوە دێڕی دووەمیشدا شاعیر بۆ هەریەکە لە (رەقیب) و (حاجی قادر) شتی تری زیادکردووە، بۆ (یەکەم) (رەزیلی) کە بەو پەسنەی جیادەکاتەوە، بۆ (دووەم)یش (موکەڕڕەم)ی، ئەوەش (دابەشکردن)ەکەیە.

- یەکێ نەمام ئەڕوێنێ، یەکێ نەمام ئەنێژێ

ئەمیان چاوەڕێی گوڵە و ئەویان فرمێسك ئەڕێژێ... ئەخۆڵ

لە نیوە دێڕی یەکەمدا دەبینین، شاعیر لە لێکنەچووندا دوو کەسی بە دوو سیفەتی لەیەکجیا لێککردۆتەوە، یەکیان نەمام ئەڕوێنێ، ئەوی دیکەش نەمام ئەنێژێ، ئەمەش (لێککردنەوە)یە.. لە نیوە دێڕی دووەمیشدا شاعیر بۆ هەریەکە لەو دوو یەکانە، شتی تری زیادکردووە، بۆ (یەکەم) (چاوەڕوانی چرۆکردنی گوڵ)، بۆ (دووەم)یش (وەراندنی فرمێسك)، کە ئەمانە ئەنجامی ئاسایی دوو کردەوەکانی سەروون، ئەوەش (دابەشکردن)ەکەیە.

شێوەیەکی تری (لێککردنەوە لەگەڵ دابەشکردن)، ئەوەیە کە لە دوو پەسنی (باش و

باشتر)ی، یان (جوان و جوانتر)ی سەرەتا شاعیر دوو شت لێکدەکاتەوە، ئینجا لە دواتریشدا، دێت بۆ هەریەکە لە شتە لێککراوەکان شتی تر زیاد دەکات بۆ وێنە:

ـ بە ڕەنگی سپییەوە چەند شۆخە، شاخی گۆیژە بیبینە

لە ڕەنگی ئاسمان دوڵبەرترە، ئەو سپییە، ئەم شینە... پیرەمێرد

لە نیوە دێڕی یەکەم و بەشی یەکەمی نیوە دێڕی دووەمدا، شاعیر دێت ڕەنگی سپی شاخی گۆیژەو ڕەنگی ئاسمان لێکدەکاتەوە، بەوەی کەوا یەکەمیان لەوەی دووەم جوانتر و دولبەرترە، ئەمەش (لێککردنەوە) کەیە.. ئینجا هەر لە نیوە دێڕی دووەمدا و لە بەشی دووەمیدا، شاعیر دێت بۆ هەر یەکە لە (ڕەنگی شاخی گۆیژە) و (ڕەنگی ئاسمان) شتی تر زیاد دەکات، بۆ یەکەم (سپی)یەتی، بۆ دووەم (شین)ی، ئەوەش (دابەشکردن)ەکەیە.

## وەسف:

هونەرێکی جوانکاری واتاییە، لە سەرچاوەکاندا باسی نەکراوە، بەڵام من بە گرنگی دەزانم، چونکە کارێکی داهێنانی جوانە و وەسفێکی ئاسایی نییە، بریتییە لە وەسفکردنی هەر کەس و شتێك، کە لە دەوروبەری نزیك، یان دووری شاعیرن و بە هۆیەك لە هۆیەکان بە ڕەوای دەزانێ وەسفیان بکات.. ئەمەش شێوازێکی دەربڕینی جوانە، لە کۆنەوە خەڵك بە گشتی و ئودەباش لە بەرهەمە ئەدەبییەکانیان بە شێوەیێکی تایبەت، سوودیان لێوەرگرتووە، چونکە شێوازێکی نایابی گرنگ و کاریگەرە، مەرجیشی ئەوەیە، وەسفەکە بۆ شتەکان ناڕاستەوخۆ بێت، نەك پیاهەڵدانی ڕاستەوخۆ بێت لە بۆیان.. بۆ نموونە:

ـ لە مەیدانی بەهارا شارەکەی کۆ

قوببەی کشمیری دا بەر شەق وەکو گۆ... حاجی قادری کۆیی

لێرەدا شاعیر کە باسی بەهاری کۆیە دەکات، ڕاستەوخۆ ئەوە نالێت، کە ئەم بەهارە چەند سەوز و دڵگیرە، بەڵام دێت بە بەرزتر لە سەوزاییە دڵگیرەکانی کشمیری دادەنێت، ئەو کشمیرەی کە لە سەرچاوەکاندا لەبەر سەوزی و جوانی بە (بەهەشتی خوا لەسەر زەوی) وەسفکراوە، دەی باشە ئەگەر ئەو کشمیرە لە بەرامبەر جوانی کۆیەدا خۆی نەگرێت و وەکو تۆپێکی یاری تورهەڵبدرێت، ئەدی باشە دەبێ کۆیە لە وەرزی بەهاردا چەند جوانبێت، چونکە ئەم شێوازە وەسفێکی ناڕاستەوخۆ و گەورەی کۆیەی کردووە، ئەوەش جوانییەکی زۆری بەخشیوە.

**جوانی وەسفکردن لە چەند شتێکە، لەوانە:**

١ـ ئاشکراکردنی خەڵك و خووە جوان و بەهێزەکان و ناساندنیان بە خەڵکی، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە وشیاربېنەوەو سوودیان لێوەربگرن.

٢ـ بەرهەمهێنانی شێوازی هونەری و ڕەوانبێژی جوان بۆ گەیاندنی پەیام، جیا لە قسەی ئاسایی، کە ئەم شێوازە هونەری و ئەدەبییە ڕۆڵی گەورەتر دەبینێ، لە هێنانەدی مەبەست.

ـ ئەی وەتەن ڕۆم و عەجەم موشتاقی کوردستانتە

ئیفتیخاری میللەتی کورد شەوکەتی عینوانتە... حەمدی

شەیدابوونی کوردستان لە لایەن ڕۆم و عەجەم و لە پاڵ ئەوانیشەوە هەموو دونیا بۆ کوردستان، ئەمە مانای دەوڵەمەندی و جوانی و هەبوونی هۆکارەکانی ژیانی باشە لە کوردستان، ئەوەش وەسفێکی جوان و شاراوەی وڵاتە لە لایەن شاعیرەوە.

**لۆمەکردن:**

بریتییە لە لۆمەکردنی هەر کەس و شتێك، کە لە دەوروبەری نزیك، یان دووری شاعیرن و بە هۆیەك لە هۆیەکان بە ڕەوای دەزانێ لۆمەیان بکات.. ئەمەش شێوازێکی دەربڕینی جوانە، لە کۆنەوە خەڵك بە گشتی و ئودەباش لە بەرهەمە ئەدەبییەکانیان بە شێوەییەکی تایبەت، سوودیان لێ وەرگرتووە.. بۆ نموونە:

ـ ئەم سەگانەی لە لای مە وەزیر و ووکەلان

بێنە لای تۆ بە خودا نایکەیە گاوان و شوان... حاجی قادری کۆیی

لەم دێڕەدا شاعیر لۆمەی خۆی ئاراستەی دەستەی فەرمانڕەوایی وڵات دەکات و نە وەزیر و نە جێگرەکانیان و نە ئەوانی دیکەش کە دەسەڵاتێکیان هەیە لەبەر لۆمی دەربازنابن، پێی وایە، ئەوانەی لەوێ شتن، لە شوێنی دیکە خەڵك بە شوان و گاوانیشیان وەرناگرێ. لە خوارەوە چەند نموونەیێکی لۆمەکردن لای ئەم دوو شاعیرە دەخەینە بەرچاو.

جوانی لۆمەکردن لە چەند شتێکدایە، لەوانە:

١ـ ئاشکراکردنی خەڵك و خووە خراپەکان و ناساندنیان بە خەڵکی، بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە وشیاربېنەوەو گۆڕانیان تیا دروست ببێت.

٣- بەرهەمهێنانی شێوازی هونەری و ڕەوانبێژی جوان بۆ گەیاندنی پەیام، جیا لە قسەی ئاسایی، کە ئەم شێوازە هونەری و ئەدەبییە ڕۆڵی گەورەتر دەبینێ، لە هێنانەدی مەبەست.

ـ کامی کچ و هەتیوی شیرین بێ ڕای دەکێشن
هاوار دەبەنە بەر کێ؟! پەشمە دەخیل و ئامان! ... حاجی قادری کۆیی

لێرەدا لۆمەی شاعیر ئاراستەی میللەتە، کە ئەگەر کوردستان کرا بە ئەرمەنستان، ئەوسا بەم شێوەیەتان لێ دێ و چ چارێکیشتان نامێنێ، مەگەر هاوار بۆ ئەم و ئەو ببەن، کە ئەمەش کارێکی نارەوا و ناشرینە، ئەدی بۆچی ئێستاکە وەها بێخەمن و تا کار لە کار نەترازاوە، بەرگرییەك ناکەن؟! بۆیە لۆمەیان دەکات و دەیەوێت بەم شێوەیە وشیاریان بکاتەوە.

ـ تۆ لە ئەرزای بۆ لە ئێمە لوتی خۆت کردە سەما
مەعریفەت بنوێنە باوی چەشم بەندی وا نەما... حەمدی

لۆمەکردنی شاعیر لەم دێڕەیدا لە خووێکی خراپی ناژیارییە، کە ئەویش خوی لوتبەرزییە، لەگەڵ ئەو بەرامبەرە دەدوێت و لۆمەی دەکات، کە وەهایەو داوای لێدەکات، وشیاربێتەوە، چونکە سەردەمی ئەوە نەماوە.

ـ بە تێشەی تەعنە عاشق بەرببێتە بێستوونی چەرخ
مەلێن شیرین نییە نامەرد تەقازای عەشقی فەرهادە... حەمدی

لۆمەی شاعیر لێرەشدا ئاراستەی خوی قسەکردنی بە نارەوای خەڵکە، شاعیر ناشرینی دەکات و دەیەوێت بیگۆڕێت.

## (جەختی وەسف وەکو لۆمە) و (جەختی لۆمە وەکو وەسف)

ڕەوانبێژەکان جەختی وەسف وەکو لۆمەو جەختی لۆمە وەکو وەسف لە یەك شوێندا باس دەکەن، ئەمەش چونکە هەردوو بابەتەکان لەسەر یەك شێوازی ڕەوانبێژی دامەزراون.

لێرەدا نووسەر لە ڕستەی یەکەمدا، سەرنجی خوێنەر بۆ واتایەك رادەکێشێ، جا بە وەسف بێ، یان بە لۆمە، پاشان بە هۆی ئەو ئامرازە جیاکەرەوەی دەیخاتە سەرەتای دووەم، یەکەمجار

لە هەڵەی دەبات، وای لێدەکات، چاوەڕوانی ئەوەبێت، کە ئێستا لە رستەی دووەمدا شتێکی پێچەوانەی ئەوەی یەکەم دەڵێت، بەڵام کە رستەکە تەواو دەکات، ئینجا خوێنەر تێدەگات، کە ئەم رستەی دووەمەش، هەر بۆ جەختکردنەوەو پشتگیری واتای رستەی یەکەم هاتووە، وەك لە خوارەوە بە نموونەوە باس لە هەردوو جۆرەکان دەکەین.

## جەختی وەسف وەکو لۆمە

ئەمە لە عەرەبیدا (تأكيد المدح بما يشبه الذم)ی پێدەگوترێت، دوو جۆری هەیە:

**یەکەم:** سەرەتا لە پەسندراودا نەفی لۆمەیەك دەکرێت، ئینجا بە هۆی یەکێ لە ئامرازەکانی جیاکردنەوە بە باشەوە وەسف دەکرێت.. بۆ وێنە:

پیاوێکی بێ عەیبە، بەڵام چ دەکەی یەکەکی تری وەکو ئەو نییە؟!

لەم نموونەیەدا، سەرەتا نووسەر هاتووە نەفی ئەوەی کردووە، کە ئەو پیاوەی پەسنی دەدات، هیچ عەیبێکی هەبێت، ئەمەش بێگومان وەسف کردنییەتی، کەچی لە رستەی دووەمدا، کە ئامرازی جیاکردنەوەی (بەڵام) دێنی، سەرەتا زەینی خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە ئێستا یەکێ لە عەیبە خراپەکانی دەڵێت، کەچی کە رستەکەی تەواو دەکات، دەڵێت (چ دەکەی کەسی تری وەکو ئەو نییە؟!)، ئینجا خوێنەر تێدەگات، کە ئەم رستەی دووەمەش هەر وەسفی بەباشی کابرایەو دەرخەری ئەوەیە، کە لە چاکییەکانی بێ وێنەیە، کەسێکی تری هاوشێوەی نییە، بۆیە ئەوەش وەسفێکی ترە، وەك جەخت کردنەوەی رستەی یەکەم هێنراوە، لەوەشدا (جەختی وەسف وەکو لۆمە) مان بۆ بەرجەستە بووە.

**دووەم:** سەرەتا پەسندراو وەسف دەکرێت، ئینجا دواتر بە هۆی ئامرازی جیاکردنەوە وەسفێکی تریش دەکرێت، وەك جەختکردنەوە بۆ رستەی یەکەمی.. بۆ وێنە:

ـ لە سەخاو لە کەرەمدا
لە فەساحەت لە ئەدەبدا
یەکە بازە لە سەفەردا
یەکە تازە لە حەزەردا
تاقە عەیبێ کە هەیبێ
هەر ئەوەیە تاقە کەسە

لە هەموو خاکی عەرەبدا
لە هەموو شاری عەجەمدا... شێخ ڕەزای تاڵەبانی
شێخ ڕەزا کە باسی یەك لە پیاوە بەڕێزەکان دەکات، چی صیفاتی جوانی سەخاوەت و کەرەم و فەصاحەت و یەکەبازی سەفەر و یەکەتاز و بێوێنەی نێو (شار)ی پێدەدات، ئەمانەش هەموویان وەسفن، دواتر دوای ئەمانە دەڵێ: تاقە عەیبێك کە هەیبێ! ئەم وشانە هی لۆمەن، بۆیە خوێنەر وا دەزانێ، ئێستا لۆمەیەکی دەکات، کەچی کە مەبەستی دەردەخات، دەڵێت: عەیبی هەر ئەوەیە لە هەموو خاکی عەرەبدا نموونەیەکی دیکەی نییە! کە ئەوەش وەسفێکی دیکەیە، بەوە بۆمان دەردەکەوێت، شاعیر دیسانەوە جەخت لەسەر وەسفی ئەو بەڕێزە دەکاتەوە، کە پێشتر لە سەرەتاوە وەسفی کردبوو، بەوەش جەختی وەسف بە وەکو لۆمە بەرهەم دێت.

ـ موحەممەد دادگەرە نیتی غەل و غەش
ئەوەی هەیتی بۆ هەمووان لێی دەدا بەش... مەلا عەبدی
لە نیوە دێڕی یەکەمی ئەم دێڕەدا شاعیر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە پێغەمبەر موحەممەد (درود و سڵاوی خوای لەسەر) دادگەرە، ئەوەش وەسفە، بەڵام لە سەرەتای نیوە دێڕی دووەمدا دەڵێت: (ئەوەی هەیتی)، بەم دەربڕینە، خوێنەر دڵی لەوە دەترسێ، مەبادا شاعیر شتێکی نەشیاو بەرامبەر پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر) بڵێ، بەڵام کە تەواوی دەکات، دەڵێت: ئەوەی هەیەتی بەشی هەمووانی لێ دەدات. دەبینین ئەمە دیسانەوە وەسفێکی دیکەیەو بەمە جەختی وەسفەکەی پێشووی دەکاتەوە، بەوەش جەختی وەسف وەکو لۆمە بەرهەم دێت.

ـ ئەی صەبا ئەی قاصیدی ئەربابی نامووس و شەرەف
هەستە تا کەرکوك بچۆ، ئازانە ئەمما لا تەخەف... بێخود
بێخود کە ڕوو لە بادی صەبا دەکات، پێی دەڵێت: ئازانە هەڵیکە، ئەمە وەسفە، دواتر ئامرازی جیاکردنەوەی (ئەمما) دێنێ، بەوە بیر بۆ ئەوە دەچێ، دوای ئەم وەسفە لۆمەیەك بکات، کەچی کە مەبەستی دەردەخات، دەڵێت: بەڵام نەترسی، ئەوەش وەسفێکی دیکەیە،

ئەمە ئەوە دەردەخات، دیسانەوە جەخت لەسەر وەسفی ئەو ژنە دەکاتەوە، بەوەش جەختی وەسف بە وەکو لۆمە بەرهەم دێت.

ـ ژن ئەمما (فی الحقیقە) خادیمەی قەوم
کە یەعنی سەییدەی غیرەت شکاران... بێخود
بێخود کە باسی ئەو ژنە دەکات، دەڵێت (ژنە)، واتە بە واتای وشە ژنە، دواتر ئامرازی جیاکردنەوەی (ئەمما) دێنێ، بەوە بیر بۆ ئەوە دەچێ، دوای ئەم وەسفە لۆمەیەك بکات، کەچی کە مەبەستی دەردەخات، دەڵێت: لە هەقیقەتدا خزمەتکاری نەتەوەکەی بووە، ئەمەش وەسفێکی دیکەیە، ئەوەش ئەوە دەردەخات، دیسانەوە جەخت لەسەر وەسفی ئەو ژنە دەکاتەوە، بەوەش جەختی وەسف بە وەکو لۆمە بەرهەم دێت.

ـ حەمەش چی وەك شێری پرچن
ئازا بەڵام تورەو تۆسن.. هێدی
لەم دێڕەدا کە باسی حەمە دەکات، سەرەتا دەڵێت حەمە وەکو شێری پرچن ئازایە، لە پاشان دەڵێت (بەڵام)، بەم (بەڵام)ە سەرەتا بیری خوێنەر بۆ ئەوە دەچێت، کە ئێستا لۆمەیەکی بکات، کەچی دواتر بە دوو وشەی تورە و تۆسن جەخت لەسەر هەمان ستایشەکەی بەشی یەکەمی گوتەکەی دەکاتەوە، ئەوەش (جەختی وەسف بە وەکو لۆمە)یە.

## جەختی لۆمە وەکو وەسف

ئەمە لە عەرەبیدا (تأکید الذم بما یشبە المدح)ی پێدەگوترێت.. دوو جۆری هەیە:
یەکەم: سەرەتا لەپەسندراودا، نەفی وەسفێك دەکرێت، ئینجا بەهۆی یەکێ لە ئامرازەکانی جیاکردنەوە، وەك جەختکردنەوەی واتای رستەی یەکەم، لۆمەشی دەکرێت، بۆ وێنە: ئەوەی خوا پێی خۆشبێت، نایکات، بەڵام ئەوەندە هەیە، ترسنۆکە.
لەم پارچەیەدا، سەرەتا نووسەر نەفی ئەوە دەکات، کە لەپەسندراودا هیچ سیفەتێکی باش هەبێت، بەڵام دواتر کە ئامرازی جیاکردنەوەی (بەڵام) دێنێت، سەرەتا خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە لەوانەیە، ئەمجارە وەسفێکی باشی بکات، کەچی کە رستەکەی تەواو دەکات (ئەوەندە هەیە

ترسنۆکه)، ئینجا بۆ خوێنەر دەردەکەوێت، کە ئەم بەشەی دووەمی قسەکەشی هەر لۆمەیەکی تره، دیسانەوە جەختە بۆ لۆمەکەی پێشوو، بەوەش دەگوترێت (جەختی لۆمە بە وەکو وەسف).

دووەم: سەرەتا پەسندراو لۆمەیەك دەکرێت، ئینجا دواتر بە هۆی یەکێ لە ئامرازەکانی جیاکردنەوە لۆمەیەکی تریش دەکرێت، بۆ وێنە:

ـ شێخ عەلی خۆ تۆ منت ئاوارە کرد و دەربەدەر

چاکە هەجوێکت بکەم، ئەمما موفیدو موختەصەر... شێخ ڕەزا

لە نیوە دێڕی یەکەمی ئەو دێڕەی سەرووددا، سەرەتا شاعیر باس لەوە دەکات کە شێخ عەلی خراپەی لە دەرهەقی کردووە، ئاوارە و دەربەدەری کردووە، بۆیە ڕێگە بە خۆی دەدات، کە وا باشە منیش هەجوێکت بکەم و پاداشتی خراپەکارییەکەی خۆت بدەمەوە، بەڵام کە دوای ئەوە ئامرازی (ئەمما) دێنێ، سەرەتا زەینی خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە دەشێت بڵێ، ئەمما لەبەر ئەوەی لە من گەورەترە و چاکەی تری لەگەڵما زۆرە، قەیناکات دەیبەخشم، کەچی کە ڕستەکەی تەواو دەکات (ئەمما موفید و موختەصەر)، ئینجا خوێنەر لەوە حاڵی دەکات، کە بە هەڵەی بردووە، دەنا مەبەستی ئەوە نییە، دوای (ئەمما)یەکە لە بڕیارەکەی خۆی لەسەر هەجوکردنی (شێخ عەلی) پاشگەزبیبێتەوە، هەجوەکەی نەکات، بەڵکو ئەوەتا هەر سوورە لەسەر هەجوکردنەکەی، جەختیش دەکاتەوە لەسەر بڕیاری هەجوکردنەکەی، ئەمەش (جەختی لۆمەی بە وەکو وەسفە).

ـ خۆشی و دەسەڵاتی خۆی دەویست بەس

بێجگە لەوە زوڵمی پێ ڕەوا بوو... هێدی

لەم دێڕەدا سەرەتا باس لەوە دەکات، کە ئەو پاشایە هەر تەنها خۆشی و دەسەڵاتی خۆی دەویست، ئەوەش بێگومان لۆمەی پاشایە، لە پاشان بە وشەی (بێجگە)، سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە ئێستا شتێکی جیا بڵێت و وەسفێکیشی بڵێت، کەچی کە قسەکەی تەواو دەکات، لۆمەی زیاتریشی دەکات و پەسنی خراپتریشی ئاشکرا دەکات، ئەوەش (جەختی لۆمە بە وەکو وەسف)ە.

سێیەم: جاری واهەیە بەبێ بەکارهێنانی ئامراز و بەشێوەیەکی تر شاعیر جەختی لۆمەکەی پێشووی دەکات.. بۆ وێنە:

ـ ئەو مریشك و کەڵەشێرەی کە گوتم بینێرە

دووی لە ڕێگە مردو یەکێکی بە نەخۆشی لێرە... شێخ ڕەزا

لە نیوە دێڕی دووەمدا، کاتێك شاعیر دێتە سەر پەسنی، ئەو مریشك و کەڵەشێرەی کە لە نیوە دێڕی یەکەم ئاماژەی بۆ کردوون، سەرەتا دەڵێت (دووی لە ڕێگە مرد) ئەمەش لۆمەیەکی بەرامبەرەکەیتی، کە مریشك و کەڵەشێری نەخۆش و دەردەداری بۆ (شێخ) ڕەوانەکردووە، بەڵام کە دەڵێت: (یەکێکی).. یەکەمجار بیری خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە دەشێت، ئەوەیان جیابکاتەوەو رستەکەی وا لێبکات (دووی لە ڕێگە مرد و یەکێکی گەیشتە ئێرە)، کەچی رستەکەی تەواو دەکات، دەڵێت: یەکەکەی تریشی بە نەخۆشی لای من مرد.. ئینجا خوێنەر تێدەگات، کە شاعیر بە هەڵەی بردووە، دەنا لە نیازی نەبووە، پەسنی بە تەنیا یەکێکی مریشکەکان بدات و لەوانی تری جیابکاتەوە، بەڵکو ئەو گوتەی دواییشی هەر جەختی لۆمەکەی پێشوویەتی، ئەوەش (جەختی لۆمە بە وەکو وەسف)ە.

## وەسفی لە بەرگی لۆمە:

وەسفی لە بەرگی لۆمە لە عەرەبیدا (المدح بما يشبه الذم)ی پێدەگوترێت.. ئەو گوتەیەیە، کە تیایدا شاعیر سەرەتا لە بەرگی لۆمە کۆمەڵە پەسنێکی خراپ، بۆ شتێ، یان یەکێ ئاراستە دەکات، بەڵام لە پاشان بەشێوەیەکی تر بڕیار دەدات و دەریدەخات کە ئەو گوتانەی پێشووی کە لە بەرگی لۆمە دەبینران، نەك بە لایەوەی لۆمە نەبووە، بەڵکو وەسف بووە.. بۆ وێنە:

ـ خزمینە مەدەن پەنجە لە تەك عەشرەتی جافا

مێروولە نەچێ چاکە وەگژ قوللەیی قافا

خوێنڕێژ و شەڕەنگێز و عەدوبەند و تەن و مەند

کامیان کە گەنە، شێرە لە مەیدانی مەصافا.. شێخ رەزا

خوێنەر کاتێ سێ نیوە دێڕەکانی یەکەمی ئەم پارچەیە دەخوێنێتەوە، سەرەتا وا هەست دەکات، شاعیر هاتووە لۆمەی عەشیرەتی جافی کردووەو کۆمەڵێ سیفات و کردەوەی خراپی خەڵکانی ئەو هۆزەی بە لۆمەوە خستۆتە روو، بە شێوەیێك، کە تا سەر ئێسقان قێزیان لێدەکات و پێیان دڵتەنگە، بەڵام لە دوا نیوە دێڕدا، کە دەڵێت: (کامیان کە گەنە شێرە لە مەیدانی مەصافا)! ئینجا خوێنەر بۆی دەردەکەوێت، کە ئەو سیفەت و کردەوانەی سەروو، کە

شاعیر خستویەتییە پاڵ پیاوانی ئەو عەشیرەتە، نەك بۆ ئەوەیە، بە هۆیەوەی ناشرینیان بکات و خۆیشی رەتیانبکاتەوە، بەڵکو زۆر دڵخۆشە بە بوونی ئەو رەوشتانەیان و وا دەزانێ لە سای ئەو رەوشتە چاکانەیاندایە، هەموو هەر شێرن، ئەمەش (وەسفی لە بەرگی لۆمە)یە.

ـ ئێستەش نالێم وەرن ڕێزی لێ بگرن

من هەر دەڵێم دەگەڵ کەسی ڕامەگرن... هێدی

لەم دێڕەدا نیوە دێڕی یەکەم کە دەڵێت (ئێستەش نالێم وەرن ڕێزی لێ بگرن)، سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە لۆمەی وەسفکراوی کردووە، بەڵام لە پاشان کە دەڵێت (من هەر دەڵێم دەگەڵ کەسی ڕامەگرن)، بەمە خوێنەر بۆی دەردەکەوێت سەرەتا بەهەڵە تێگەیشتووە، چونکە مەبەستی شاعیر وەسف کردنە، نەك لۆمەکردن، ئەوەش (وەسفی لە بەرگی لۆمە)یە.

**لۆمە لە بەرگی وەسف:**

(لۆمەی لە بەرگی وەسف) لە عەرەبیدا (الذم بما يشبه المدح)ی پێدەگوترێت، پێچەوانەی (وەسفی لە بەرگی لۆمەیە) بریتییە لەو دەربڕینەی، کە شاعیر تێیدا سەرەتا بە باشی ستایشی یەکێك، یان شتێك دەکات و پەسنی دەدات، بەڵام دواتر دەریدەخات، کە لە گوتەکەی مەبەستی لۆمەیە نەك وەسف.. بۆ وێنە:

ـ گوڵە باغ گوڵە باغ گوڵی باغی

بێ عەقل و زۆر بێ دەماغی

لەم دێڕەدا بە گوڵەباغ وەسفی بەرامبەر دەکرێت، خوێنەر وا دەزانێ پەیامی دێڕەکە وەسفکردنە، بەڵام کە دێڕەکە تەواو دەبێ، دەردەکەوێ مەبەست لۆمەیەو لە بەرگی وەسف پێشکەش کراوە.

ـ ئەتۆ زەمم دەکەی، مەدحت دەکەم من

جەزای قەولی درۆ، با هەر درۆبێ... نالی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا، شاعیر هاتووە، روو لە هاوڕێکەی دەکات، ئەوەی کە هەمیشە لۆمەی

دەکات، بەهەق و ناهەق بە بەرچاوی خەڵکانەوەی دەیشکێنێت، بەڵام پێی دەڵێت: کەچی مــن وەکو تۆ نابم بتشکێنمەوەو بە خراپییەکانتدا بڵێم، بەڵکو مــن وەســفت دەکــەم، ئەمــەش لــە خۆیدا وەسف دەگەینێت، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەمدا، کە شاعیر دێتە سەر وەڵامــی ئــەوەی، کە لە نیوە دێڕی یەکەمدا، بڕیاری کردنی داوەو دەڵێت، بۆیە مەدحت دەکەم، چونکە کــە تــۆ لۆمەی من دەکەی، درۆدەکەی، منیش بە هەمان شێوە دەبــێ پاداشــتی تــۆ بدەمــەوە، بۆیــە ئەگەرچیش وەسفت لێ نەهێت، بەڵام وەسفت دەکەم.. لێرەشدا تێدەگەین، کە مەبەستی شاعیر لۆمەیە نەك وەسفکردنی بەرامبەری، ئەگەرچیش لە قاڵبی وەسفکردندا لۆمەکەی ئەنجام بدات، ئەوەش لە ڕەوانبێژیدا (لۆمەی لە بەرگی وەسف)ی پێدەڵێن، لەم نموونەیەدا، شاعیر بە ئاشکرا هۆی لۆمەکردنی بەرامبەرەکەی ئاماژە پێکردووە.

بەڵام جاری وا هەیە، شاعیر ناڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ هۆی لۆمەکردنی بەرامبەرەکەی دەکات، بۆ وێنە:

ـ ئەگەر شیعرێ بڵێم و نەشری کەم هیچم لە کەس ناوێ

لە فیکرا پەیڕەوی مەرحومی زاتی شێخ ڕەزا ناکەم.. موفتی پێنجوێنی

لەم دێڕەی (موفتی پێنجوێنی)دا، سەرەتا وای پیشان دەدات، کە (شێخ رەزا) لە لای زۆر بەڕێز و گەورەیە، بەڵام ناڕاستەوخۆ دێت گلەیی و لۆمەیەکی ئاراستەی (شێخ ڕەزا) دەکات، ئەویش وەنەبێ بڵێ (شێخ رەزا) ئەو سیفەتە خراپەی هەبووەو جێی خۆیەتی بەر لۆمەی بخەین، بەڵکو وەك ئاماژەمان بۆ کرد، سەرەتا شێخ رەزا زۆر هەڵدەنێ، لە دواییدا بە ناڕاستەوخۆیی لەوەی دەیلێت، کە من لەسەر نەشرکردنی شیعری خۆم داوای هیچ شتێ لە کەس ناکەم وەك شێخ رەزا، ئەمە ئەوە دەگەینێت، کە شێخ رەزا لەم بارەیەوە سیفەتێکی خراپی بووە و لەسەر شیعرەکانی داوای شتی لە بەرامبەرەکانی کردووە.. بۆیە لە راستیدا ئەگەرچیش بەرگی وەسف لە لایەن شاعیرەوە کرابێتە بەر ئەو دێڕەی لە بەرامبەر شێخ رەزادا، بەڵام لە ناواخندا لۆمەی دەکات و جۆرێکە لە (لۆمەی لە بەرگی وەسف)دا.

جۆرێکی تری (لۆمەی لە بەرگی وەسف) ئەوەیە، کە سەرەتا شاعیر پەسنێکی پەسندراو دەدات، بەڵام لە پاشان یەکسەر پێچەوانەکەشی دەڵێت.. بۆ وێنە:

ـ شکلی تەکیە و خانەقاهی شێخەکان

ـانیعەن ڕەنگینە، ئەمما بۆ ڕیان... حاجی قادری کۆیی

لەم دێڕەدا، سەرەتا شاعیر دانی بەوە داناوە، کە شێوەی تەکیە و خانەقای شێخەکان جوان و ڕەنگینن، ئەمەش وەسفێکی چاکە، بۆ ئەو خانەقاو تەکیانە، کەچی دوای ئەوە هەر بە ئاشکرا دێت عەیبێکی گەورەیان باس لێوە دەکات، ئەویش ئەوەیە دەڵێت ئەو شوێنانە ئەگەرچی دەبێ بۆ خواپەرستی بینا بکرێن، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ ئەو مەبەستە بینا نەکراون و ریاکارییان تێدا دەکرێت، ئەوەش لۆمەیەکی گەورەیە ئاراستەی ئەو دەامەزراوانەی دەکات، بۆیە گەرچی سەرەتا وەسفێکیشی کردبن، بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستی شتێکی پێچەوانەیە و (لۆمەی لە بەرگی وەسف)ە.

### چەند نموونەیێکی دیکەی لۆمەی لە بەرگی وەسف:

ـ شێخی من بەو غایەتە پشتی لە عالەم کردووە

صورەتی خۆشی لەنێو ئاوێنە پشتی تێ دەکا... حاجی قادری کۆیی

لێرەدا شاعیر بە (شێخی من) باس لە شێخەکەی دەکات، ئەوەش وشەی وەسفکردنە، بەڵام بەو تۆمەتەی دەیداتە پاڵی، کە: لەبەرئەوە پشت لە خەڵك دەکات، چونکە وێنەی خۆیشی لە ئاوێنە پشتی تێدەکات! هەست دەکەین دەیەوێت بەمە گەوجێتی و بێئەقڵی شێخەکەی دەربخات، ئەوەش کەوابێ لەم نموونەیەی هێناویتییەوە مەبەستی لۆمەی شێخە، نەك مەبەستی دەرخستنی ئەقڵ و حیکمەتی شێخ بێت، ئەوەش لۆمەی لە بەرگی وەسفە، چونکە نابێ هەموو شتێك وەکو خۆی وەربگیرێ، بەڵکو کەسی ئاقڵ هەر شتەی بە جۆرێك تێدەگات و سوودی لێوەردەگرێت، کە شێخی ئەو وەکو خەڵکی ئاقڵ نییە و وەکو کەسی گەوجە و گێلە و بە هەڵە شتەکان پراکتیك دەکات.

ـ توخودا مەنعی مەکەن هەرچی بکا حاجی فەرەج

چونکە خوا فەرموویەتی ﴿لیس علی الأعمی حرج﴾ ... حەمدی

شاعیر لەم دێڕەیدا داوای ئەوە دەکات، کە هیچ کەسێك ڕێگری لە حاجی فەرەج نەکا، چیدەکات با بیکات، چونکە خودا فەرموویەتی کوێر چ حەرەجێکی لەسەر نییە، ئەمە لە باری ئاساییدا خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، شاعیر وەسفی حاجی فەرەج دەکات و بەزەیی پێدادێتەوە،

لە دەمئەندامە، بەڵام لە راستیدا لەولاوەش مەبەستی لەم قسەیەی ناشیرینکردنی حاجی فەرەجە، چونکە راستە کوێر لە ئەنجامدان و نەدانی هەندێ شت عوزری هەیە، بەڵام خۆ لە هەموو شتێکدا هەر عوزری نییە، شاعیر بە دەربڕینی هەرچی دەکا، هەل وەردەگرێ و مەبەستیەتی ئەم پیاوە تەواو نییە، یانی نەك هەر کوێرە بەڵکو ئەقڵیشی تەواو نییەو نەك هەر شتە ماددییەکان، بەڵکو شتە مەعنەوییکانیش نابینێ، بەوەش کەواتە نەك هەر مەبەستی وەسفی حاجی فەرەج نییە، بەڵکو مەبەستی لۆمەکردنیەتی، ئەمەش لۆمەی بە وەکو وەسفە.

ـ کە پیربووم تێگەیشتم دەستی گرتم

لە کەسب و کار و تەحصیلی مەعانی... حاجی قادری کۆیی

دەست گرتن باشە، بۆیە کە سەرەتا هاتووە، خوێنەر وا دەزانێ وەسفە، بەڵام کە دەڵێ: لە کەسب و کار و تەحصیلی مەعانی! ئیتر ئەمە دەبێتە لۆمەو بەوە لۆمەی لە بەرگی وەسف بەرهەم دێ.

ـ شای ئەو دەمە ناوی ئەژدەهاك بوو

شای چی؟ وەك شێری سامناك بوو... هێدی

لەم دێڕەدا سەرەتا شاعیر باس لە شایەك دەکات، کە ناسراوە ناوی (ئەژدەهاك)ە، ئینجا پرسیار دەکات، دەڵێت: (شای چی)، بەوەش خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، ئێستا وەسفی بکات، چونکە دەربڕینی (شا چ شا) یان هەر دەربڕینێکی هاوشێوەی لە کوردیدا بۆ مەبەستی ستایش و پیاهەڵدان دێت، کەچی شاعیر کە دێڕەکەی تەواو دەکات، دەڵێت (وەکو شێری سامناك بوو)، بەمە لۆمەی دەکات، خوێنەر لێرەدا وشیار دەبتەوە، کە مەبەستی شاعیر ناشیرنکردنی شایە، نەك جوانکردن و خۆشەویستکردنی، ئەوەش (لۆمەی لە بەرگی وەسف)ە.

ـ وەڵڵا لەسەر ئەو جوانییە

فڕی بە دنیاوە نییە... هێدی

لەم دێڕەدا شاعیر کە باس لە جوانی وەسفکراو دەکات، دەڵێت: وەڵڵا لەسەر ئەو جوانییە، بیر بۆ ئەوە دەبات، ئێستا وەسفی دیکەیشی دەکات، کەچی کە زیاتر دەڵێ، ئەمجارە لۆمەی دەکات، ئەمەش (لۆمەی لە بەرگی وەسف)ە.

ـ شەڕی وا هەر نابێتەوە

یاخوا بڕواو نەیێتەوە... هێدی

لەم دێڕەدا سەرەتا شاعیر کە باسی ئەو شەڕە دەکات، دەڵێت: شەڕی وا هەر نابێتەوە، بەوەش سەرنجی خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە شەڕەکە شتێکی بەسوود بووبێت، بۆیە کە دواتر دەڵێت (یاخوا)، خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە ئێستا وەسفێکی دیکەی ئەو شەڕە دەکات و شتێکی دیکەی باشی لەبارەوە دەڵێت، کەچی کە دێڕەکەی تەواو دەکات، دەڵێت: (بڕواو نەیێتەوە)، بەوەش خوێنەر دێنێـتەوە سەرسامی و بەمە (لۆمەی لە بەرگی وەسف) دروست دەکات.

## پۆشین:

(پۆشین) لە عـەرەبیدا (التوریە)ی پێدەڵێن.. بریتییە لە دروستکردنی پەیوەندی لە نێـوان دوو شت، یەکیان واتایەکی دووری هەبێ، ئـەوی تریـان واتایـەکی نزیـك، بـەڵام لـە دەقەکـە مەبەست واتا دوورەکە بێ.. یان بەواتایەکی تر: پۆشین ئەوەیە شاعیر، یـان نووسـەر وشـەیەك بێنێت، ئەو وشـەیە دوو واتـا بگـەینێت، یـەکی دوور و یـەکی نزیـك، ـ (کـە دەڵـێین دوور، مەبەست ئەوەیە پیاو درەنگ بۆی دەچـێ نـەختێ لێکدانـەوەی پێـدەوێ، بـەڵام کـە دەڵـێین: مانایەکی نزیك، مەبەست ئەوەیە، کە گوێگر یان خوێنەر هەر زوو بۆی دەچێ و وەریدەگرێ) ـ جا مەرجە لە پۆشین، شاعیر، یان نووسەر مەبەستی بەم وشە جـووت واتایـە، واتـا دوورەکـە بێت.

بێگومان ئەم واتا دوورەش وەنەبێ لە خوێنەری زرنگ و هۆشیار ون و شـاراوەبێ، بـەڵکو هەر ئەوەندەیە، کە سەر لە خوێنەری کەمبین دەشێوێنێ و نەزاکەتێکی تەڕیش پەیدا دەکات.. بۆ وێنە:

ـ بۆ کەرێ ئیعلانی حەربی کرد، لەگەڵمان شێخ حەسەن

سەیری کەن یاران چ گۆبەندێکی گێڕا، ئەوکەرە... شێخ رەزا

لێرەدا وشەی (کەر)، کە شاعیر لە کۆتایی نیوە دێڕی دووەمـی بـەکارهێناوە، دوو واتـای هەیە، نزیکەکەیان (کەر)ە راستییەکەی نیوە دێڕی یەکەمە، کە لەسەریدا شەڕ و گۆڤەنـدێکی گەورە نراوەتەوە، بەڵام مانا دوورەکەی (شێخ حەسەن)ە، کاتێ (شێخ رەزا)ی شاعیریش وشـەی (کەر)ی لە نیوە دێڕی دووەم بەکاردێنێ، مەبەستی پێی مانا دوورەکەیە، کە (شێخ حەسەن)ە،

بەڵام ئەوەی پۆشیوە، بەو وشە (کەر)ە راستەقینەی یەکەمجار هێنابووی، چونکە ئەگەر شێخ حەسەن تێشبگات، شێخ رەزا پاساوی هەیە و دەڵێ من مەبەستم کەرە گوێدرێژەکەیە، چۆن قسە بە بەڕێزێکی وەکو جەنابت دەڵێم، بەوەش شێخ حەسەن هیچی بۆ نامێنێتەوەو ئەگەر برواشی پێنەکات، بەڵام چ پاساویشی نابێ، شتێك لە دژی شێخ رەزا بڵێ.

### جۆرەکانی (پۆشین):

پۆشین وەکو یەك لە شێوازە جوانەکانی دەربڕین زیاتر لە جۆرێکی هەیە، لەوانە :

**یەکەم: پۆشینی رووت**

بریتییە لە بە تەنیا هاتنی ئەو وشەیەی کە (پۆشین)ەکەی لێدروست دەبێت، بەو شێوەیەی کە هیچ هێماو ئاماژەیەکی لە تەك نەهاتبێت، ئەوە بخاتە روو مەبەست واتا نزیکەکە، یان دوورەکەیە.. بۆ نموونە:

- (بانگی کوردستان)ە، وا دنیایی ئیحیاکردەوە

زامی قەلبی کوردی بێچارەی موداوا کردەوە... ئەحمەد موختار جاف

لەم دێڕەدا (بانگی کوردستان) بە دوو واتادێت، واتایەکی نزیك کە مەبەست لێی گۆڤاری (بانگی کوردستان)ە، کە لەو رۆژگارەدا بڵاو دەبووەوە، کوردی بووژاندۆتەوە، واتاییەکی دووریش، کە دوای بیرکردنەوە وای لێ تێدەگەیشترێ، کە مەبەست لێی جاری سەربەخۆیی و ئازادی کوردستان بێ، کە بە زمانی حاڵ داوای خەبات لە پێناو ئازادی و چوونە ریزی وڵاتان لە رۆڵەکانی دەکات، مەبەستیش واتا دوورەکەیە، ئەمەش بێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەکی لە تەك هاتبێ، بۆ ئەوەی دەریبخات، کە مەبەست کامە مانایە.

**دووەم: پۆشینی پاڵاو**

بریتییە لەو پۆشینەی، کە لە تەك ئەو وشەیەی کە پۆشینەکەی لێ دروست دەبێت، وشەیەکی تر هاتبێت، وای دەربخات، کە هێمایە بۆ واتا نزیکەکە، ئەمەشیان هەر بۆ ئەوەیە، تا زیاتر بیر و هۆشی گوێگر بۆ لای مانا نزیکە نامەبەستەکە بچێت و زەین و هۆشی لە مانا دوورە مەبەستەکە دوور بکەوێتەوە.. بۆ نموونە:

- تا(سلێمان)ان نەبوونە صەدری تەختی ئاخیرەت

ئەحمەد موختاری ئێمە، شاهی تەخت ئارانەبوو... نالی

ئەم پارچەیەی سەروو، دێڕێکە لە هۆنراوەیەکی (نالی)، تیایدا مێژوویەکی بۆ ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشای سێیەمی بابان داناوە، ئەم ئەحمەد پاشایە لە پاش مردنی سولەیمان پاشای باوکی هاتۆتە سەر تەخت، جا لەم دێڕەدا وشەی (ئەحمەد) بە دوو واتا دێت.. وەك چۆن وشەی (سلێمان)یش بە هەمان شێوەی بە دوو واتا دێت.. واتایەکی نزیکی ئەو وشانە (ئەحمەد) پێغەمبەری ئیسلامە و (سلێمان) پێغەمبەری بەنی ئیسرائیلییانە (درووود و سلاّوی خودایان لەسەر)، کە مەبەست لێرەدا ئەو واتا نزیکەیان نییە، بەلاّم بۆ بیر سەرەتا بۆ ئەو واتا نزیکەیان دێت؟ چونکە ( صەدری تەختی ئاخیرەت) و (موختار) کە شاعیر لە دێڕەکەدا یەکەمیانی وەپاڵ (سلێمان) و دووەمیانی وەپاڵ (ئەحمەد)داوە درووودو سلاّوی خوایان لێ بێ، پەیوەندییان هەیە بەو پیاوە بەڕێزانەوە، خوێنەر بە هۆی ئەم وشانە وا لە دێڕەکە دەگات، کە (نالی) مەبەستی لێیان ئەوەیە بڵێ (تا سلێمان پێغەمبەری بەنی ئیسرائیلییان و پێغەمبەرانی تری هاوشێوەی کۆچی دواییان نەکرد و بەرەو دوا مەنزڵی ئاخیرەت نەڕۆیشتن، ئەحمەدی موختاری ئێمە (واتە محەمەدی پێغەمبەری ئێمە- درووود و سلاّوی خوای لێ بێ- کە یەکێ لە ناوەکانی ئەحمەدەو بە ئەحمەدی موختاریش ناوبراوە)، نەهاتە دونیاو وەك پێغەمبەرێك دەرنەکەوت. ئەمە مانای نزیکی ئەو وشانەو بەیتەکە دەخەنەڕوو، بەلاّم مانای دووری بەیتەکە ئەوەیە شاعیر مەبەستی لە (سلێمان) سلێمان پاشای سێیەمی بابانە و مەبەستی لە (ئەحمەدی موختار)یش، ئەحمەد پاشای کوڕی ئەو سلێمان پاشایەیە، لە بەیتەکەیدا مەبەستی ئەوەیە (کە تا سلێمان پاشای سێیەمی بابان و هەردوو سلێمانەکەی پێش ئەویش نەمردن لە دونیا دەرنەچوون، سرەی دەرکەوتن و هاتنە سەرتەختی ئەحمەد پاشا نەهاتەپێش و نەبووە پاشای بابان) ئەمە واتای دووری بەیتەکەیە و هەر ئەو واتایەش مەبەستی شاعیرە، جا بەم شێوەیە، پۆشینە کە تیایدا وشەی (پۆشین) وشەیەکی وای لەگەڵداهات پەیوەندی بە واتا نزیکەکەی وشە پۆشراوەکە هەبوو، ئەڵێن (پۆشینی پالاّو).

**سێیەم: توانج پۆشی:** بریتییە لەو پۆشینەی، کە تیایدا ئەو وشەیەی (پۆشین)ەکە دروست دەکات، هەر لە دێڕەکە، یان لە پارچە هۆنراوەکە، بۆ دوو وشە بگەڕێتەوە، یەکەمیان لە داڕشتن و واتادا وەکو خۆی بێ، کە ئەمە دەلالەتی مانا نزیکەکەی بگەینێ و مەبەست نەبێ، بەڵکو وەك نیشانەیەك شاعیر هێنابی تا ئەگەر ویستی لە مانا دوور و مەبەستەکەی دێڕەکەی پاشگەزببێتەوە، بتوانێ سوود لەو نیشانەیە وەربگرێ و خۆی پێ دەرباز بکات، وشەی

دووەمیش، کە ئەو وشەی (پۆشین)ە، کە دروست دەکات، بۆی دەگەڕێتەوە، لە ڕەگەزێکی ترەو واتا دوورە مەبەستەکەیە.. بۆ وێنە:

ـ گەرچی هەژار و موفلیسە شێخ مامە سالم

نەمدی کەسێ وەکو ئەو ساحیبی کەرەم

میوانی بووم نان و کەرەی نایە بەر دەمم

ئێستاش بەبێ موداهەنە مەمنونی ئەو کەرەم... شێخ ڕەزا

وشەی (کەر)ی نیوە دێڕی یەکەمی دێڕی دووەم، بە دوو واتا دێت، یەکەمیان کە ئەوە مانا نزیکەکەیە، ئەو (کەر)ەیە کە بەیانیان لەگەڵ نان و چا دەخورێت، لێرەدا ئەو کەرەیە مەبەست نییە، بەڵام شاعیر ئەم وشەیەی وەکو نیشانەیەکی پۆشراو هێناوە، تا ئەگەر ویستی ئەو توانجەی خۆی کە لە دێڕەکەدا گرتوویەتی بە هۆیەوەی بتوانێ بیپۆشێ، هەرچی واتای دووەمیشە، کە ئەوە واتا دوورەکەیتی، (شێخ مامە سالم) خۆیتی، کە لێرەدا (شێخ ڕەزا) بەرتوانجی دەگرێ و بە کەر و گوێدرێژێکی بێ ئەقڵی دەچوێنێ.

## ڕێبازی گوتەیی:

لە عەرەبیدا (المذهب الکلامي)ی پێدەگوترێت.. لەلای (ئیبنول موعتەز) بە هونەری پێنجەمی (جوانکاری) دانراوە، (ئیبن و ڕەشیق) لە بەشی دووەمی کتێبەکەی خۆیدا (العمدة) دەڵێت: ڕێبازێکی گوتەیی فەلسەفییە، (زەرکەشی)ش دەڵێت: بریتییە لە پاساوهێنانەوە بۆ واتای مەبەست، بە پاساوێکی ئەقڵی وەها هیچ لاملێییکردنێك بۆ خۆی نەهێڵێتەوە. واتە بەڵگە ئەقڵییەکە بڕوا بە بەرامبەر بێنێت و ڕایەکی دیکەی بۆ نەهێڵێتەوە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕایانەش دەتوانین بڵێین: بریتییە لەوەی شاعیر، یان نووسەر لەسەر شێوازی کەلامییەکاندا بەرگری لەو بیرەی خۆی بکات، کە پێشکەشی دەکات و بەرگریکردنەکەیشی لە بیرەکەی خۆی بە بەڵگەی ئەقڵی وەهابێت، بەرانبەر چ بیانوویەکی بۆ نەمێنێتەوەو یەکسەر بڕوای پێبکات. بۆ نموونە:

ـ لە کابرایەکی کوردیان پرسی خودا چەندە؟

وتی: هەر یەکە

وتیان: بەچیدا دەیزانی؟

وتی: بە ئاشەکەی ماڵی لالەما.

وتیان: چۆن؟

وتی: ئاشەکەی لالەم تا هەر هی خۆی بوو، باش ئەگەڕا، بەڵام لەو ڕۆژەوەی بوو بە شەریك لەگەڵ حەمەی میروەیسدا، ئیتر پەکی کەوت! ئەم دنیایەش هەروایە، ئەگەر خودا یەکێکی تری لەگەڵ بووایە، هەر لە زووەوە ئەم دام و دەزگایە تێك دەچوو.

لەم پارچەیەدا، دەبینین کابرای پرسیارلێکراو، بۆ ئەوەی پرسیاری بەرامبەرەکانی بەکۆتابێنێ و ئیتر بڕوایان پێکات، دێت بەڵگەیەکی جوانیان بۆ دێنێتەوەو پاڵپشتییەکی بەهێز بۆ قسەکەی خۆی دێنێتە پێش.

ـ ئەتۆ خۆت بوویە گورگی مێگەلی خۆت
ئیتر کێ بیت و دڵسۆزی بکا بۆت
لە خوێندا سوور بووە دندوکی ئاڵت
ئەبێ بیگریە ئەستۆی خۆت وەباڵت... هێدی

بەڵگەکە ئەقڵییە، ئەگەر ئادەمیزاد خۆی بووە دوژمنی میللەتی خۆی، ئیدی کێ لە بۆیان دەبێتە دۆست، بێگومان کەس نابێ بە دۆست لە بۆیان.

## جێگۆڕین:

لە عەرەبیدا (العکس) و (القلب)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لەوەی دەربڕین، لە سنووری وشەی لێکدراودا بێ یان ڕستە بێ، چ لە سەرەتاوە تا کۆتایی وشەکانی بخوێنرێتەوە، چ لە کۆتایی بۆ سەرەتا وشەکانی بخوێنرێتەوە هەر هەمان شت دەربچێت، بۆ نموونە:

ـ یەزدانی تاك و تەنیا، سەتتار و کردگاری
بێ عەیبی عەیب دەپۆشی، کردگار و سەتتاری.. بێبەش

لەم دێڕەدا لە نیوە دێڕی یەکەم، کە شاعیر باس لە یەزدانی مەزن دەکات، بە (سەتتار و کردگار) پەسنی دەدات، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەمدا کە هەر بەردەوام دەبێ، لەسەر پەسنی (یەزدان) ئەمجارە بە (کردگار و سەتتار) پەسنی دەدات، ئەمەش وێنەیەکی ئاشکرای (جێگۆڕین)ە، چونکە دوو پەسنەکانی (سەتتار و کردگاری)، لە جاری دووەمدا شاعیر هەڵیگەڕاندوونەتەوەو پاش و پێشی کردوون.

- تەنگانە وا دەبێ کە لەو جێگە تەنگەدا
سائیل نەکیری عاریف و مەعروف مونکەرە... نالی

(نەکیری عارف) کە لە سەرەتای نیوە دێڕی دووەمدا هاتووە، دواتر لە کۆتایی دێڕەکە کراوەتە (مەعروفی مونکەر)، بەوەش (جێگۆڕین) بەرهەم هاتووە.

جوانی جێگۆڕین لەوەدایە، کە جۆرێکە لە گەمەکرد بە وشە، ئەوەش زۆرجار واتا دەگۆڕێت و هەندێ جاری تریش واتا وەکو خۆی دێڵتەوە، بۆ نموونە (شێت چا دەکەی) واتە: دەتوانی شێتان لە نەخۆشییەکەیان رزگار بکەیت و چاکیان بکەیتەوە، بەڵام کە جێگۆڕینی لێ دروست دەکرێت و دەبتە (چا دەکەی شێت)، ئەم رستەی دووەم واتاکەی جیاوازە، واتە: تۆ هۆیەکی بۆ ئەوەی خەڵك شێت بن. ئەوەش جوانییەکە دەبەخشێت.

هەندێ جاری تریش بۆ جەختکردنەوە لەسەر هەمان واتای یەکەم دێت، بەڵام بە شێوەیەکی نوێ، کە خوێنەر لە وەڕسی رزگار دەکات.

- هونەرمەندیت لەوەیدا نازەنینم
کە هەم شێت چادەکەی هەم چادەکەی شێت... حەسەنی دانیشقەر

لەم دێڕەدا لە نیوە دێڕی دووەم شاعیر دەڵێت: (شێت چادەکەی)، لە دوای ئەو ئەو رستەیەی هەڵگێڕاوەتەوە، جێگۆڕکێی بە وشەکانی کردووەو کردوویەتییە (چادەکەی شێت). بەوەش شاعیر (جێگۆڕین)ی دروست کردووە.

- ئەڵێم ئەوجار ناوت بێنم
ئەوجار ئەڵێم بتناسێنم... هێدی

(ئەڵێم ئەوجار) کە لە سەرەتای نیوە دێڕی یەکەمدا هاتووە، دواتر لە کۆتایی لە نیوە دێڕی دووەمدا کراوەتە (ئەوجار ئەڵێم)، بەوەش (جێگۆڕین) بەرهەم هاتووە.

- نە تۆ بە بێ من، نە من بە بێ تۆ، ئەژین لە ژیان
ئاڵاین بە یەکدا، وەك و تان و پۆ، یەك لاشە یەك گیان... سەلام

(تۆ) و (من) هەردووکیان راناوی کەسی سەربەخۆن، جاری یەکەم (تۆ) لە پێش (من) هاتووە، بەڵام جاری دووەم جێگۆڕکێیان پێکراوەو، ئەمجارەیان (من) لە پێش (تۆ) خراوە.

## چەند جۆرێکی جێگۆڕین

**١- جێگۆڕینی وێنەی چەسپاو.. بۆ نموونە:**

ـ عالەم شەوانی کردووەتە ڕۆژی ڕۆشنا

ئەم ڕۆژی ڕۆشنایە بە نیوە شەوانمان... حەمدی

نیوە دێڕی یەکەمی ئەم دێڕە رستەییێکی سادەیە، (عالەم شەوانی کردووەتە ڕۆژی ڕۆشنا) لە پاشان ئەم رستەیە هەڵگەڕێنراوەتەوەو جێگۆڕکێ بە وشەکانی کراوە، بووەتە (ئەم ڕۆژی ڕۆشنایە بە نیوە شەوانمان).

**٢- جێگۆڕینی وێنەی جولاو.. بۆ نموونە:**

چۆنت کە ئەکرد کافری موتڵەق بە موسڵمان

بەو نەوعە موسڵمانە ئەکەن ئێستە بە کافر... حەمدی

ئەوسا ________________ ئێستا

کافری موتڵەق ________________ موسڵمان

موسڵمان ________________ کافر

**٣- جێگۆڕینی واتایی.. بۆ نموونە:**

ـ مەپرسە دەردی غەریبی و لەزەتی وەتەنم

ئەوی لە دەستی دەگریام ئەمێستە بۆی دەگریم... حاجی قادری کۆیی

لە نیوە دێڕی دووەم: (لە دەستی دەگریام) وەکو واتا هەڵگەڕێنراوەتەوەو کراوەتە (ئەمێستە بۆی دەگریم).

**تێلنیشان:**

تێلنیشان لە عەرەبیدا (تلمیح)ی پێدەگوترێت.. بریتییە لە ئاماژەدانی شاعیر، بە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەیەك، یان پەندێکی پێشینان و ڕووداوێکی مێژوویی گرنگ، یان داستان و بەسەرهات و هەر شتێکی تری هاوشێوە، بەڵام بێ ئەوەی کە ئاماژە بۆ شتێ دەکات، لەسەری بوەستێ و بە درێژی باسی بکات، بەڵکو هەر بە ئاماژەیەکی خێرا بەسەریاندا تێدەپەڕێت.. بۆ وێنە:

ـ بەدەم وشەیەك لای خوا هاتە خوار

بۆ سەر پێغەمبەر سەرکردەی نازدار

﴿إقرأ﴾ بخوێنە هێمای رزگاری

لە گشت تاریکی و ژان و بێزاری.. قەرەداغی

لەم پارچەیەدا، شاعیر کە وشەی (إقرأ)ی خستۆتە نێو دێڕەکانی، ئاماژەیەکی خێرای بەم چەند ئایەتە پیرۆزە کردووە، کە بۆ یەکەمجار جوبریلی ئەمین (سەلامی لەسەر) بۆ سەر پێغەمبەری دابەزاند (دروود و سلاوی خوای لێ بێ) و پێی فەرموو ﴿ٱقْرَأْ باسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ ٱلإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلأَكْرَمُ (٣) ٱلَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ ٱلإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥)..﴾.. سورەتی پیرۆزی (العلق) ئایەتەکانی (١ تا ٥)، بەڵام ئاماژەکەی شاعیر ئاماژەیەکی خێرایە بۆ ئەو ئایەتە پیرۆزانە، بێ ئەوەی لە سەریان بوەستێ و درێژەیان پێبدات.

**جۆرەکانی (تێلنیشان):**

بە گوێرەی ئەو بابەتەی تێلنیشانی بۆ دەکرێت، تێلنیشان بۆ زیاتر لە شتێك دەکرێت و بە هۆیانەوە مەبەستی قسەکەر فراوانتر و بەهێزتر دەکرێت، لەوانە گرنگترینیان:

**١ـ تێلنیێشان بۆ ئایەتی قورئانی پیرۆز.. ئەو تێلنیشانەیە کە بە وشە، یان بە واتاییێك ئاماژە بۆ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەکات.. بۆ نموونە:**

ـ ئەوە شاهەنشەهە بۆ عەبد و پاشا

موعەللەق خەیمەیی ئەفلاکی هەڵدا... حاجی قادری کۆیی

تێلنیشان بۆ ئایەتی پیرۆز ﴿اللّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لأَجَلٍ مُّسَمًّى يُدَبِّرُ الأَمْرَ يُفَصِّلُ الآيَاتِ لَعَلَّكُم بِلِقَاء رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ﴾.. سورەتی پیرۆزی ﴿الرعد﴾ ئایەتی ژمارە (٢).

ـ ئاو و ئاگر یەك ئەخەی وەك بە زگێ زابن ئەوان

شاهیدی حاڵی ئەوان ((في الشجر الأخضر نار))... مەولانا خالیدی نەقشەبەندی، و: پیرەمێرد

((في الشجر الأخضر نار)) تێلنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلأَخْضَرِ نَاراً فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾.. سورەتی پیرۆزی (یس) ئایەتی (٨٠).

ـ به نەصصی (كل نفس) هەر فەرامۆشیت ببێ (نوری)

نییه چاره دەبێ بمرین، بەشەر بەم تەرزە خولقاوه.. نووری

( كل نفس) له نیوه دێڕی یەکەمدا، تێلنیشانه بۆ ئایەتێ پیرۆزی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾.. سورەتی پیرۆزی ﴿الأنبياء﴾ ئایەتی (٣٥).

جاری وەها هەیه له سنووری دێڕە شیعرەکه زیاتر لـه وشـەیەك تێلنیشـان بـۆ ئایـەتێکی قورئانی پیرۆز دەکات، بۆ نموونه:

ـ به قەلبی (مطمئن)ی بوو نیدایی (ارجعي) گەر بیست

به ئەمری (فادخلي) سەربەست له بۆ باغی جینان ڕۆیی... خادیم

وشەکانی: (مطمئن)، (ارجعي)، (فـادخلي) هەموویان تێلنیشانن بۆ ئەو ئایەتـه پـیرۆزەی دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ٱرْجِعِـي إِلَـىٰ رَبِّـكِ رَاضِـيَةً مَّرْضِـيَّةً (٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي (٢٩) وَٱدْخُلِي جَنَّتِي (٣٠).. ).. سورەتی ﴿الفجر﴾.

**٢ـ تێلنیشانی ڕووداوێکی له قورئان تۆمارکراو.. ئەو تێلنیشانەیه که به وشه، یان به واتاییێك ئاماژه بۆ ڕووداوێکی قورئانی پیرۆز دەکات.. بۆ نموونه:**

زیایی جیلوەییێکی ئاگری بەردایه کێوی توور

به بەحسی کلکه تووریێکم که من مەعلومه بریانم... حەمدی

تێلنیشانه بۆ ڕووداوێکی له قورئانی پیرۆزدا باسکراو، که ئەویش بریتییه له تەجەللای خوای گەوره بۆ کێوی توور و هەپڕوون به هەپڕوون بوونی ئەو کێوه، به هۆی دەرکەوتنی ئەم تەجەللایەی خودای گەوره. وەکو ئەم ڕووداوه له قورئانی پیرۆز تۆمارکراوه، که دەفەرمویێت: ﴿وَلَمَّا جَاء مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَـكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكّاً وَخَرَّ موسَى صَعِقاً فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ﴾.. ﴿الأعراف : ١٤٣﴾.

**٣ـ تێلنیشان بۆ فەرمووده و ئایەت.. ئەو تێلنیشانەیه که به وشه، یان به واتاییێك لەیەککاتدا ئاماژه بۆ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر) دەکات.. بۆ نموونه:**

ـ بەبێ دینی جەمالی بێ قەرینی

خەلایق سەر بە سەر ئیمانی هێنا... حاجی قادری کۆیی

جەمالی بێ قەرین.. تێلنیشانە بۆ فەرموودەی ((الله جميل يحب الجمال))

بێ قەرین (ئەگەر بە تەنها وەرگیرا)، یان هاتبا.. تێلنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی ﴿...لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ﴾.. ﴿الشورى : ١١﴾.

ـ خودا ئەم ئاینەی لایق بەئەبوبەکر و عومەری دیوە

کە ئەووەل ﴿ثاني﴾و، پانی شەرەفیاوە بە (لوکان)... مەحوی

لە نیوە دێڕی یەکەمی ئەو دێڕەدا، شاعیر بەدوای یەکدا ناوی دوو هاوەڵی بەڕێزی وەکو (ئەبو بەکری صدیق) و (عومەری کوڕی خەتاب)ی هێناوە (ڕەزای خوایان لێبێ). لە نیوە دێڕی دووەمیشدا بە وشەی (ثاني) ئاماژەی بۆ ئەبوبەکر و بەوشەی (لو كان) ئاماژەی بۆ (عومەر) کردووە.. کە بەم دوو پەسنە، ئەو دوو بەڕێزەی لە ژیانی خۆیاندا پەسنداوە.. مەبەست لە (ثاني) تێلنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلْعُلْيَا وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾.. سورەتی پیرۆزی ﴿التوبة﴾، ئایەتی (٤٠)، کە ئەمە ئایەتێکە باس لەو دوو کەسە دەکات، کە لە شەوی هیجرەتە بەناوبانگەکەی پێغەمبەردا (دروود و سڵاوی خوای لێ بێ) لایاندایە ئەشکەوتی (پور)، دوو کەسەکەش یەکەمیان حەزرەت خۆی و دووەمیشیان (ئەبو بەکری صدیق)ی هاوەڵی بوون، کەوابێ وشەی (پانی) بۆ (ئەبو بەکر) تێلنیشانە.

وشەی (لوكان)ەش تێلنیشانە بۆ ئەو فەرموودەیەی، کە تیایدا پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خوای لێ بێ) دەفەرمووێت: ((لو كان بعدي نبي لكان عمر))، کە ئەمەش شاعیر دەڵێت شەرەفێکە بۆ (عومەر) کە هێشتا هەر لە ژیاندا بوو، پێی شەرەفیا.

٤ـ تێلنیشان بۆ فەرموودە: ئەو تێلنیشانەیە کە بە وشە، یان بە واتاییێك ئاماژە بۆ فەرموودەییێکی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر) دەکات.. بۆ نموونە:

ـ سەر نامەیی نامە، نامیێ ئەڵڵاھ

بێ نامیێ وی ناتەمامە وەڵڵاھ.. ئەحمەدی خانی

لەم دێڕەدا کە شاعیر دەڵێت، سەرەتا بە ناوی (ئەڵڵاھ) دەست بە نووسین دەکەم، چونکێ بێ ناوی وی، نووسینەکەم بێ بەھاو بێ بایەخ و ناتەواو دەردەچێ، ئەم وتەیەی ئاماژەیە بۆ ئەو فەرموودەیەی کە تیایدا پێغەمبەری ئیسلام (دروود و سلاوی خوای لەسەر بێ) دەفەرموویت: ((کل کلام او امر ذي بال لایفتح بذکر الله عز وجل فهو ابتر او قال اقطع)) بڕوانە: (مسند امام احمد، ذ: ٨٥٣٠).

**٥ تێلنیشان بۆ گوتەی نەستەق و پەندی پێشینان.. ئەو تێلنیشانەیە کە بە وشە، یان بە واتاییێك ئاماژە بۆ گوتەییێکی نەستەق، یان پەندێکی پێشینان دەکات.. بۆ نموونە:**

ـ ئەم ئەرزە کۆنە ھەوارە خەلایقیش کۆچە

تەماعی سوری کەس نەبێ لەژێر چادری شین... حاجی قادری کۆیی

نیوە دێڕی دووەم تێلنیشانە بۆ گوتەی نەستەقی: کەس لە دونیایێ بە تەمای خۆشی نەبێ!

ـ خولاسە گەر قسەی ڕاستی دەپرسی

ئەوی خۆی تێرە ناپرسێ لەبرسی.. موفتی پێنجوێنی

لەم دێڕەشدا، نیوە دێڕی دووەم، تێلنیشانە بۆ ئەو پەندەی پێشینان کە تیایدا، دەڵێن (زگی تێر ئاگای لە برسی نییە).

**٦ـ تێلنیشان بۆ سەربردە و ئەفسانەی فۆلکلۆر.. ئەو تێلنیشانەیە کە بە وشە، یان بە واتاییێك ئاماژە بۆ سەربردەییێکی فۆلکلۆری دەکات.. بۆ نموونە:**

ـ ئەو ڕزقی موقەڕڕەرە بە خۆی دێ

سەد دەفعە بخوازی یا نەخوازی... حاجی قادری کۆیی

ئەمە تێلنیشانە بۆ گەلێ سەربردەی فۆلکلۆری، کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە: خودا ڕازیقەو ئەو ڕزقەی داناوە بۆ بەندەکانی، ھەر پێیان دەگەینێت.

ـ بۆچی حەمدی وا بە سووکی سەیری ئەھلی دڵ ئەکا

بۆ بە گوێیا نەچووە مێشوولە کە چی کردووە بە فیل... حەمدی

تێلنیشانە بۆ ھەقایەتی مێشوولەو فیل، کە لە فۆلکلۆر بە چێژەوە پێشکەشکراوە.

ـ خودا بیدا لە دێڕێکی دەیدا، سەیری هەیە ڕێکەوت
وەنەوزم دا، نیگارم هاتە خەو، ئەمشەو خەوم پێکەوت... مەحوی
لە نیوە دێڕی یەکەمدا، شاعیر تێلنیشان بۆ ئەو سەربردە کۆنە دەکات، کە دەڵێت: ساڵێکیان جووتیارێك زۆر چاك خۆی ئامادەکردبوو، بۆ جووت و تۆو کردنێکی زۆر، کەچی هەر لە سەعاتی یەکەمی جووتەکەی گەڕایەوە ماڵ و وازی لە جووتەکەی و لەزەوییەکەیشی هێنا، ئەمەش چونکە هەر کە هەوجارەکەی دادەبەستێ، لە دێڕی یەکەمی جووتەکەیدا هەوجارەکەی گیر دەبێت، کە دێت تەماشا بکات، داخوا لەچی گیر بووە، دەبینێ کووپەیەك گیری کردووە، پڕی لیرە زێڕە.. ئیتر خۆڵەکەی بەسەردا دەکاتەوە، لە تاریکی شەودا ولاغ دێنێ، هەر هەموو لیرەکان بار دەکات و لەگەڵ خۆی بۆ ماڵەوەی دێنێتەوە.. بۆ بەیانیش کۆڤی لێ قیت دەکات، دەچێتە بەر دیوەخان بۆ قسەی خۆش و بەلای کارەکەیدا ناچێتەوە، خەڵکی کە وای دەبینن و ئاگایان لەسەربردەکەی نییە، سەیریان پێ دێ، هۆیەکی دیار بۆ ئەمە نابینن، بۆیە کە دێن پرسیاری ئەوەی لێدەکەن: بۆچی وازت لە جووت و کارەکەت هێنا، ئەدی بەچی دەگوزەرێنی؟ وەڵامیان دەداتەوە: (خوا ئەگەر بیدا لە دێڕێکی دەدا)! من هەر زوو جۆخینی خۆم هەڵگرت و تازە پێویستیم بەجووت و تۆو کردن نەما.. جا نیوە دێڕی یەکەمی شاعیر (خودا بیدا لە دێڕێکی دەدا..) تێلنیشانە بۆ ئەو سەربردەیە.

ـ جار بە جارێ بە لەقە لێی دەخوڕێ بە توندی
ئەڵێی ڕۆستەمی زاڵە سوار بووە لە شەودێزە... لوتفی
ئەم دێڕە کە باس لە یەکێ دەکات، شاعیر دەیچوێنێ بە ڕۆستەمی زاڵ و سوار بوونی لە شەودێزە.. تێلنیشانە بۆ (ڕۆستەمی زاڵ)و ئەفسانەکەی، کە یەکێکە لە ئەفسانەکانی ولاتی فارس و کەوتۆتە نێو ئەفسانەکانی میللەتانی ڕۆژهەلات.

**تێبینی:**

شایانی باسە هەندێجار تێلنیشان لە وشەیەك زیاتر تێدەپەڕێنێ و دەچێتە سنووری رستەش، بەڵام دیسانەوە هەر تێلنیشانە و تێکهەڵکێش، یان لێیوەرگرتن نییە، چونکە واتای مەبەست دەریدەخات، تێلنیشانە، نەك ئەم دووانەی تر، بۆ نموونە:
ـ بۆ نیشانەی عیززەتی یاسین بە بانگی بەرز ئەلێ

باسی میعراجی شەریفی (الذي أسرى) ئەکا... قانع

﴿الذي أسرى﴾ هەرچەندە رستەشە، بەڵام هەست دەکەین ئاماژەیەو تێلنیشانە بۆ پاکی و تەنیایی خودای گەورەو نواندنی موعجیزەی ئیسراو میعراج بە موحەمەدی پێغەمبەر و نێردراوی خۆشەویسی خۆی، وەکو هاتووە: ﴿سُبْحَانَ ٱلَّذِى أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلأَقْصَى ٱلَّذِى بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَآ إِنَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلبَصِيرُ﴾.. ﴿الأسراء: ١﴾.

ـ تەئسیری قەتعییە بە دوعا باوەڕت ببێ
﴿ٱدْعُونِي أَسْتَجِبْ﴾ وەکو گەوهەر لە گوێ گرین... مەحوی

لەم دێڕەدا ﴿ٱدْعُونِي أَسْتَجِبْ﴾ بەشێکە لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمْ ٱدْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾.. (غافر:٦٠).. ئەوەش دیسانەوە راستە لە سنووری رستەدا هاتووە، بەڵام هەر تێلنیشانە، چونکە مەبەستی شاعیر تێلنیشانە بۆ تەواوی ئایەتە پیرۆزەکە.

ـ بە حاڵی خۆت بکە ڕەحمێ هەتا وەك سفرە نەدڕاوی
لە ئایەی ﴿ما خلقت الجن والأنس﴾ سەرنجێ دە... خادیم

﴿ما خلقت الجن والأنس﴾ تێلنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات: ٥٦).. من ئەجندە و ئادەمیزادم بۆ هیچ خەلقنەکردووە، بۆ ئەوە نەبێ بمپەرستن، چونکە مەبەستی شاعیر ﴿إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ەکەیە، کە بووار نەبووە لە دێڕەکەیدا ئەویش بڵێ.

جاری وەها هەیە ئایەتە کراوەتە کوردی و بە واتا دەربڕینەکە دەبێتە تێلنیشان بۆ ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، بۆ نموونە:

ـ ئەووەل ئەتۆی و ئاخیر ئەتۆی، هەرچی هەی ئەتۆی
نەت ئیبتیدا لە ئەووەل و نەت لە ئاخر ئینتیها... عەبدوڵڵا بەگی میصباح دیوان

نیوە دێڕی یەکەم بە واتای خۆی، تێلنیشانە بۆ ئایەتی پیرۆزی: ﴿هُوَ ٱلأَوَّلُ وَٱلآخِرُ وَٱلظَّاهِرُ وَٱلْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾.. (الحديد: ٣).

### جیاوازییەکانی نێوان (تێکهەڵکێش) و (تێلنیشان):

١ـ لە (تێکهەڵکێش)دا، شاعیر راستەوخۆ ئایەتێکی پیرۆزی قورئان، یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر (درود و سلاوی خوای لەسەر)، یان دێڕێك، یان نیوە دێڕی شاعیرێکی تر، یان پەندێکی پێشینان، یان هەر شتێکی تر وەك خۆی و بەبێ دەستکاری کردنیان وەردەگرێ، لەگەڵ هۆنراوەکەی خۆی (تێکهەڵکێش)یان دەکات، بەلاّم لە (تێلنیشان)دا شاعیر بە وشەیەك، یان زۆر جار بە واتا ئاماژە بۆ ئەو ئایەت و فەرموودە و پەند و رووداوانە دەکات.. وەك لە نموونەکانی پێشوو ئاماژەمان بۆ کردن.

٢ـ لە (تێکهەڵکێش)دا، جاری واهەیە، شاعیر ئاماژە بەوەش دەکات، کە ئەم دەبڕینە ئایەتە، یان فەرموودەیە، یان هی شاعیر و کەسێکی ترە، یان ئەگەر هیچیش نەڵێت، ئەوا لە نووسیندا ئەو پارچەیەی بە نووسینەکەی خۆی تێکهەڵکێش کردووە، جا لە شیعر بێ، یان لە پەخشان، لە نێو کەوانەی دەخات، بەلاّم لە (تێلنیشان)دا شاعیر ئەم ئاماژە و کەوانانە بەکارناهێنێ، چونکە راستەوخۆ هیچ شتێکی وەرنەگرتووە، ئەوە نەبێ بەخێرایی ئاماژەیەکی بۆ شتەکان کردووە.

٣ـ (تێکهەڵکێش) یەکێکە لە هونەرەکانی (جوانکاری وشەیی)، بەلاّم (تێلنیشان) یەکێکە لە هونەرەکانی (جوانکاری واتایی).

### فرەواتایی

(فرەواتایی) بریتییە لە بەکارهێنانی وشە یان چەند وشەو دەستەواژەیەك، کە بەسەریەکەوە، زیاتر لە واتایەك ببەخشن.. بۆ وێنە:

ـ گوڵی حاجیلەکانی دەشتی هاموون

نەکەی بیدەی بەنەرگسجاڕی گەردوون... حاجی قادری کۆیی

لەم دێڕەی سەرەوەدا، دەشێت نیوە دێڕی یەکەم بەکۆمەڵە واتاییێك بێت، لە وانە:

١ـ (گوڵ)ە (حاجیلەکان)ی دەشتی هاموون.

٢ـ (گوڵ)ە (حاجیلە)ی دەوروبەری (کانی) دەشتی هاموون.

٣ـ (گوڵ)ە (حاجیلە)ی دەوروبەری (کان)ی دەشتی هاموون.

٤ـ (گوڵی حاجیلە) و (کانی) دەشتی هاموون.

٥ـ (گوڵی حاجیلە) و (کان)ی دەشتی هاموون.

٦ـ (گوڵی حاجیلە)، (کوانێ) دەشتی هاموون.

## جۆرەکانی (فرەواتایی):

لە (فرەواتاییی)دا بە گوێرەی توانای شاعیر و بــە گــوێرەی بیرتیــژی خوێنــەریش، دەشــێت دێڕێك، یان نیوە دێڕێك زیاتر لە واتایەك هەڵگرێت، دوو بێ، یان ســێ بــێ، یــان چــوار، یــان زیاتر.. لێرەدا بۆ وێنە ئەم نموونە و جۆرانەی خوارەوە ئاماژە پێدەدەین:

**یەك:** دەشێ نموونەکە لە رستەیەکدا بەرجەستەببێت.. بۆ نموونە:

ـ فیکری موخالەفەتی وەتەن مەحو ئەکاتەوە.

(ئەهلی مەعاریفی) بە قسەی خۆشی خۆی ژیان... زێوەر

نیوە دێڕی دووەم، دەشێ بە یەکێ لەم واتایانە هاتبێت:

١ـ رۆژنامەی (ژیان) خوێنەرانی بە قسە خۆشەکانی ژیاند.

٢ـ رۆژنامەی (ژیان) بە قسەو پڕوپاگەندەی خۆی، گوایــە بــە بابــەت و بەرهــەمی چــاکی خوێنەرانی ژیاندوون.

لێرەدا دەبینین نموونەکە لە رستەیەکدا بەرجەستەبووە.

**دوو:** دەشێ نموونەکە لە (گرێ) یەکدا بێت.. بۆ وێنە:

ـ دایکی بەسۆز و دڵسۆز و دڵخۆش

لە پێشوازیدا بە ڕوویێکی خۆش

لەگەڵ باوەدا پیری بڕوادار

کردیانە باوەش ڕۆڵەی تۆبەکار... باوکی ئازیز

نیوە دێڕی یەکەمی ئەو پارچەیە کە (گرێ)یەکە، دەشێت، بەو واتایانە بێت:

١ـ دایکی سێ کچەکان (بەسۆز) و (دڵسۆز) و (دڵخۆش).

٢ـ دایکی بەسۆز، لەگەڵ (دڵسۆز) و (دڵخۆش).

٣ـ دایکی بەسۆز و دڵسۆز، لەگەڵ (دڵخۆش).

٤ـ دایکی کوڕە تۆبەکارەکە بە بەسۆزی و دڵسۆزی و دڵخۆشییەوە.

## پاساوهێنانەوە:

(پاساوهێنانەوە) بریتییە لەوەی شاعیر سەرەتا شتێك بڵێت، دواتر بێت پاساوێك بێنێتەوە بۆ ئەو قسەیەی کە زووتر کردوویەتی، بۆ وێنە:

ـ ڕێیەك مەدە بەر بە تاقی تەنیا

هەوراز و نشێوی زۆرە دنیا... هێدی

لەم دێڕەدا شاعیر ئامۆژگاری ئازیزێکی دەکات، کە بە تەنیا ملـی ڕێ نـەگرێ، بـەڵام بـۆ سەلماندنی قسەکەی خۆی، تا زیاتر کار بکاتە سەر بەرامبەرەکەی، دێت پاساوێك بۆ قسەکەی یەکەمی دینێتەوە، دەڵێ: بۆیە وات ئامۆژگاری دەکـەم، کـە بـە تـەنیا هەڵنەکـەی، چـونکە (هەوراز و نشێوی زۆرە دنیا) ئەمەش بەڵگەی شاعیرە و پاساویەتی لە بۆ ئەو ئامۆژگارییـەی سەرەتا بۆ ئازیزەکەی کردبوو.

## جۆرەکانی (پاساوهێنانەوە):

بە گوێرەی دەربڕینی شاعیر یان نووسەر، دەکرێت چەند جۆرێکی پاساو هێنانەوە هـەبێت، ئەمە لە شیعریش و لەپەخشانیش دەبێت.. بۆ نموونە:

### ١ـ (پاساوهێنانەوە)ی بە بەکارهێنانی ئامرازی پاساوهێنانەوە:

ـ چونکە یەك نوسخەی خاڵی لە غەڵەت

دەست نەکەوت غەیری خراپ و سەقەت

وا (چروستانی) بە سەعی و تەلاش

ساغی کردەوە نوسخەی ئەمما باش... چروستانی

لەم پارچەیەدا سەرەتا شاعیر پاسـاوەکەی هێناوەتـەوە، بـۆ سـاغکردنەوەی ئـەو نوسـخە کتێبەی، کە کاری لەسەر کردووە، ئامرازی (چونکە)ی پاساوهێنانەوەی بەکارهێناوە، کە ئـەم ئامرازە لە هەمانکاتدا ئامرازی لێکدەریشەو دوو ڕستە بەیەکەوە لێکدەدات.

### ٢ـ (پاساوهێنانەوە)ی بێ بەکارهێنانی ئامراز، بۆ وێنە:

ـ مەصلەحەت وایە، هەتا نەیخواردووم، بینێرمەوە

زۆر دەترسم دەفعەیەك قوتم بدا، بمکا بە قووت... شێخ ڕەزا

لەم دێڕەدا، لە نیوە دێڕی یەکەمدا، دوای ئەوەی شاعیر باس لە هەناردنەوەی ئێسترێکی دەکات، کە یەکێ لە میرەکانی دۆستی بە دیاری بۆی ناردووە، لە نیوە دێڕی دووەمدا پاساو بۆ کارەکەی دێنێتەوە، کە ئەمەم لەبەر ئەوەیە، ئێسترەکە هەندە برسی و بێ خێرە، دەترسم ڕۆژێك لە برسان قەمپاڵێ لە منیش بداو بە دەردی وێنجەو جۆیەکەم ببات.. بۆیە لە نیوە

دێڕی دووەمدا مەبەستی ئەوەیە بڵێت: (چونکە زۆر دەترسم دەفعەیەك قووتم بدا، بمکا بەقووت)، بەڵام لەبەر کێشی شیعرەکە ناتوانێ ئامرازی (چونکە) بەکاربهێنێ، لای دەبات، واتاش بەڵام هەر هەمان واتا دەمێنێ و گۆڕانی بەسەردا نایێت.

**بەهەڵەبردن:**

بریتییە لەو دەربڕینەی، کە سەرەتا لە مێشکی بەرامبەردا، واتایەك دروست دەکات، بەڵام کە قسەکەر قسەکانی تەواو دەکات، ئینجا بەرامبەرەکەی بۆی دەردەکەوێت، کە بە هەڵەچووە، ئەگینا مەبەست بە تەواوی پێچەوانەی ئەو واتایەیە کە یەکەم جار بۆی دروستبووە.. بۆ نموونە:

ـ ئەم: بەرەئی تۆ، تەلەفزیۆنی خەڵك موسەقەف دەکات؟

ئەو: تەبعەن.

ئەم: چۆن چۆنی؟

ئەو: من خۆم تەجرەبەم هەیە.. هەرکاتێ تەلەفزیۆنەکە داگیرسێنن، من لە داخا دەچمە ژوورەکەی ئەودیو، دەست ئەکەم بە کتێب خوێندنەوە)... گۆڤاری سیخوڕمە.

لەم پارچەیەدا، کاتێ (ئەم) پرسیاری تەلەفزیۆن لە (ئەو) دەکات، کە (بە رای تۆ خەڵك موسەقەف دکات)، (ئەو)یش وەڵام دەداتەوە: (تەبعەن). سەرەتا (ئەم) بەهەڵەدەچێ، وا دەزانێ بێگومان تەلەفزیۆن بەرنامە و بابەتانێکی رۆشنبیری بەهێز و بەپێز پێشکەش دەکات، بەو هۆیەوە خەڵکی رۆشنبیر دەکات، بەڵام کە دەیەوێت دڵنیابێ و تەواو بۆی دەرکەوێ (چۆن چۆنی) پرۆسەی خەڵك رۆشنبیر کردنەکە بەهۆی تەلەفزیۆنەوە دەکرێت.. (ئەو) وەڵامی دەداتەوە: (من خۆم تەجرەبەم هەیە.. هەرکاتێ تەلەفزیۆنەکە داگیرسێنن، من لە داخا، دەچمە ژوورەکەی ئەودیو، دەست دەکەم بە کتێب خوێندنەوە!).. بەوە (ئەم) بۆی دەردەکەوێت، بەهەڵەبراوە، ئەگینا مەبەستی (ئەو) هەر لە سەرەتا ئەوە نەبووە، کە (ئەم) بۆی چووەو لە مێشکیدا دروستبووە.

## شێوازەکانی (بەهەڵەبردن):

(بەهەڵەبردن) دەشێ لە شێوازێك زیاتری هەبێ، لەوانە:

یەکەم: دەشێ ڕاستەوخۆ کەسی (یەکەم)، (دووەم) بەهەڵە ببات، بۆ وێنە:

ـ یەکەم: دەزانی تا تۆم نەدەناسی، وام دەزانی زۆر هیچ و پووچی؟!

دووەم: بە ڕاست؟! ئەی ئێستا ؟!

یەکەم: ئێستا یەقینم هات!!.

لێرەدا هەر کە سەرەتا کەسی یەکەم ڕوو لە دووەم دەکات بەهەڵەی دەبات، بەڵام دووەم نازانێ.. ئەی کەی لەخۆی دەگات، کە بە هەڵەبراوە؟ ئەوکاتە تێدەگات، کە دەیەوێت دڵنیابێ لەوەی ئێستا چی وایکردووە ڕاکەی بگۆڕێ و لەم بارەیەوە پرسیاری لێدەکات، بەڵام کە (یەکەم) وەڵامی ئەداتەوە (ئێستا هەر یەقینم هات) کە تۆ لە ڕاستیدا وەك پێیشتر دوور بەدوور تێدەگەیشتم هیچ و پووچ بی، ئێستا دڵنیا بووم لە هیچ و پووچییەکەت.. بەمەش دووەم دەشکێتەوە، ئینجا تێدەگات، کە هەر سەرەتا کەسی یەکەم لە قسەکەی مەبەستی ئەوە نەبووە، کە بڵێ: جاران وا لە تۆ دەگەیشتم، بەڵام ئێستا نا.. کە لە ڕاستیدا قسەکەی کەسی یەکەم ئەوەی لێدەخوێنرایەوە، بەڵکو هەر سەرەتا مەبەستێکی تری بووە، بەڵام لەو شێوازەی دەربڕینی، هاتووە (دووەم)ی بەهەڵەبردووە.

دووەم: دەشێ دوای پرسیاری کەسی (یەکەم)، (دووەم) بە هەڵەی ببات، بۆ وێنە:

ـ یەکەم: ئەرێ تۆ کاك فلان ئەناسیت؟

دووەم: ئەی چۆن نایناسم، عائیلەوییەن شەڕەجنێومان لە نێوان دایە!

لێرەشدا کە (دووەم) وەڵامی پرسیارەکەی (یەکەم) دەداتەوە، وەڵامەکەی ڕستەیەکی لێکدراوە، بەشی یەکەمی (ئەی چۆن نایناسم)، (یەکەم) بەهەڵەدەبات، چونکە وا تێدەگات پەیوەندییان لەگەڵ یەك باشبێ و لە نزیکەوە یەکتر بناسن، بەڵام کاتێك قسەکەی درێژە پێدەدات و دەڵێت: (عائیلەوییەن شەڕە جنێومان لە نێوان دایە!) ئینجا (یەکەم) تێدەگات، کە بەهەڵەبراوە، دەنا (دووەم) مەبەستی ئەوە نەبووە، لە قسەکەی وەك ئەو تێگەییوە پەیوەندییان لەگەڵ یەك باشبێ، بەڵکو مەبەستی شتێکی ترەو دەیەوێت بڵێت، پەیوەندیمان لەگەڵ یەك هەر تەنها شەڕە جوێنەو بەو شێوە یەکتر دەناسین.

**دوو نموونەی بەهەڵەبردن:**

ـ تا وەها بێ ئیتتیفاق و سەرکەشی بێ شێوەتان

تاجی کیبر و نیخوەت و غیرەت لە سەرتان دادەنێ... حاجی قادری کۆیی

لەم دێڕەدا شاعیر کاتێك دەڵێت: (تاجی کیبر و نیخوەت و غیرەت لە سەرتان دادەنێ)، خوێنەر سەرەتا وای بۆ دەچێت، مەبەستی شاعیر ئەوەیە بڵێ: (تاجی گەورەیی و پاشاییتان دەخاتە سەر سەر)!! واتە دەتانکاتە پاشاو گەورەتان دەکات!! بەڵام لە راستیدا مەبەستی شاعیر ئەوە نییە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە لە خۆیاندا پاشای لوتبەرز و سەرکێش و تورەتان بۆ دادەمەزرێنێت و دەیخاتە سەرتان، بە هۆشیەوەی خراپە و ئازاری جۆراوجۆرتان تووش دەکات، تووشی رۆژە رەشی خۆتانتان دەکات، ئەوەش کەواتە (بەهەڵەبردن)ەو شێوازێکی خۆشی بەرهەمهێناوە.

ـ هەوێنی شیری سافی شیعری حەمدی باسی شێخانە

دەترسم بیبزرکێنن، کە نابن قەت بە بێ ئاشووب... حەمدی

لە نیوە دێڕی یەکەمدا باسی شێخانی بە هەوێنی شیعرەکانی خۆی داناوە، ئەمەش خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، وا بزانێ لەبەر گرنگی و پیرۆزی شێخەکان، چونکە هەوێن زۆر گرنگ و پیرۆزە بۆ ئەوەی شیرەکە بگەیێنێتە دوا قۆناغ و بیکاتە ماست، کەچی کە تەواوی دەکات، دەڵێ دەترسم شیعرەکەم ببزرکێنن وەکو ماست، چونکە شێخەکان هەمیشە بە بەڵاو ئاشووبن! ئەمە خوێنەر سارد دەکاتەوەو ئەوەی لە لا دروست دەبێ، کە بەهەڵەچووە، دەنا مەبەستی شاعیر لە سەرەتاوە پیاهەڵدان و بە گرنگگرتنی شێخان نەبووە.

**جوانی بەهەڵەبردن:**

خوێنەر لە سەرەتاوە تێی ناگات و دواتر لەوە دەگات، کە مەبەست شتێکی وردترە لەوەی رواڵەتی دەربڕین لە مێشکیدا دروستی کرد.

## خۆهەڵەکردن:

(خۆهەڵەکردن) لە عەرەبیدا (تجاهل العارف)ی پێدەڵێن.. لە کوردیشدا (راگومکی ئاشنا) و (خۆگێل کردن)ی بۆ بەکارهێنراوە.. بریتییە لە خۆهەڵەکردنی شاعیر بەرامبەر شتێك، کە باش دەزانێ راستی ئەو شتە چییە، یان چۆنە، بەڵام بۆ مەبەستێکی تایبەت، بەوشێوەیە خۆی هەڵەدەکات، بۆ وێنە:

ـ بۆ هەوا ئاڵۆزە؟ بۆچی لێڵ و سوورە ئاسمان؟
گێژە لووکی نەگبەتە؟ یان فیتنەیی ئاخرزەمان؟... حەمدی

ئەو دێڕە پارچەیەکە لەو هۆنراوە بەناوبانگانەی (حەمدی) شاعیر، کە دوای کارەساتەکەی (٦)ی ئەیلوولی (١٩٣٠)، بەردەرکی سەرای سلێمان گوتوویەتی، بۆ تەعبیردان لەو غەمە زۆرانەی، کە بەهۆی گوللە بارانکردنی خەڵکانێکی بێ تاوانی شارەکەی، کە تەنها لەبەر داوای مافەکانیان بەم دەردە بران.. شاعیر ئەم راستییەو هۆی رووداوی کارەساتەکەو کەوتنی خەڵکە شەهید و زامدارەکەو.. هتد، هەموو ئەوانە باش دەزانێ، بەڵام کە هۆنراوەکەی دەهۆنێتەوە، بەشێوەیەکی وا دەست پێدەکات، خۆی لە راستییەکە هەڵە دەکات، وەك ئەوەی ئاگای لە دەنگ و باس نەبێ، لەبەر تێکچوونی باری ئاو و هەواو سووربوونی رەنگی ئاسمان کەوتبێتە شیعر گۆتن، کەچی لە دێڕەکەی دواتری دەبینین، دەڵێت:

ـ ئەم هەموو لاوە نەمامن نێژران لەم باخچەیە
ریشەیی کوردایەتی بوو، یەعنی بۆمان نێژران... حەمدی

ئەوەش ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، کە شاعیر هەر لە سەرەتاوە زاینویەتی مەسەلە چ بووە، بەڵام بۆ مەبەستێکی شاعیرانە هاتووە، لە دێڕی یەکەمدا، خۆی هەڵەکردووە.

شایانی باسە حەمدی شاعیر لە شیعرەکانیدا زۆر گرنگی بەم شێوازەی خۆهەڵەکردن دەدات و لە شوێنانی زۆر و بۆ زۆربەی مەبەستەکان، دێت بە شێوازی خۆهەڵەکردن مەبەستەکەی دەخاتەروو.. ئەمانەی خوارەوە هەندێ لەو نموونانەی ئەون.

ـ هەوری قەهرە مەوجی دەریای غەزەب دێنێتە جۆش
یا فیغان و دوو کەڵی ئاهی هەناسە سەردەکان... حەمدی
ـ وەختە ساڵێکە کە رۆژێکم نەدیوە هەر شەوە
مردنە ئەو حاڵە یا ئاخیر زەمانە یا خەوە... حەمدی
ـ ئاوە یا نوورە لە عەکسی خۆر کە ئەبریسکێتەوە

ئەهلی حیکمەت وا دەزانیٚ دووڕڕەکانی کانتە... حەمدی

لە هەموو ئەو نموونانەش شاعیر هۆی راستەقینەی ئەو دۆخانە دەزانیٚت، کە باسیان دەکات، بەڵام وای پیشان نادات و بە پیٚچەوانەوە خۆی لە هۆی راستەقینەیان بیٚ ئاگا پیشان دەدات، ئەوەش جوانییەکی ئەدەبی دەداتە تیٚکستەکان.

## هۆیەکانی (خۆهەڵەکردن):

(خۆهەڵەکردن) وەك هونەریٚکی جوانکاری دەشیٚت بە چەند هۆیەکەوە بیٚت، لە وانە:

یەکەم: (خۆهەڵەکردن) لەبەر هۆی سیاسی: وەکو لە دوو نموونە یەکەمەکانی سەروو خرایەڕوو.

دووەم: (خۆهەڵەکردن) لەبەر مەبەستی شاعیر خۆی، تا شیعرەکەی بەڕای خۆی جوانتر بخاتەڕوو:

ـ لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە، تۆراوە دڵی من<br>
هەرچەند دەگەڕیٚم، بیٚ سەروشویٚن ماوە دڵی من<br>
ئاخۆ بە چ شاخیٚکەوە، گیرساوە دڵی من<br>
یاخۆ بە چ داخیٚکەوە سووتاوە دڵی من... بیٚخود

ئەمە یەکیٚکە لەو چوارینانەی هۆنراوەیەکی دریٚژ و بەپیٚزی شاعیر، تیایدا وەك دیارە، لەم پارچەیە و لە چەندان پارچەی دواشی هەر بە دوای سۆراغی دڵەکەیەتی، وەك دەڵیٚ لیٚی ونبووەو نایدۆزیٚتەوە، کەچی لە کۆتاییدا لە یەکیٚ لە چوارینەکانی دوایی لە پڕیکا دەڵیٚت:

ـ مەعلوم چووە بۆ خزمەتی سالاری مەدینە<br>
وامزانی کە فەوتاوە، نەفەوتاوە دڵی من... بیٚخود

بەمەش دەردەکەویٚت کە هەر لە سەرەتاوە شاعیر بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی، خۆی هەڵەکردووە، ئەگینا دڵ شتیٚك نییە ونبیٚ و خاوەنەکەی پیٚی نەزانیٚت، کە لیٚرەشدا مەبەستی لە دڵ، مەیل و سۆزی دڵەکەیتی، واتە مەبەستی لە دڵە مەعنەوییەکەیتی، نەك ئەو دڵەی کە پارچە گۆشتیٚکەو لە سنگیدایە.

## جیاوازی نێوان (بەهەڵەبردن) و (خۆهەڵەکردن):

گەربێت و نموونەکانی پێشووی ئەو دوو هونەرە بەراورد کەین، کە لە بۆ هەریەکەیان ئاماژە بۆ کرا، دەکرێ گرنگترین جیاوازییەکانیان لە مانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

١ـ (بەهەڵەبردن) لەو دەربڕینانە بەرجەستە دەبێت، کە بریتییە لە وتووێژی نێوان دووکەس، بەڵام (خۆهەڵەکردن) کاتێ دروست دەبێت، کە شاعیر لە شێوەی پرسیارکردن لە کۆمەڵێ شتدا، بێ رەچاوکردن و ویستنی وەڵامی بەرامبەر دەیانخاتەڕوو.

٢ـ لە (بەهەڵەبردن)دا هەردەم کە دووکەسی بەرامبەر قسە بۆ یەك دەکەن، هەمیشە مەبەستی قسەکەری یەکەم لە قسەکەی، بە هەڵەبردنی دووەمە، بەڵام دووەم درەنگ تێی دەگات، کەچی لە(خۆهەڵەکردن)دا شاعیر خۆی هەر لە سەرەتاوە دیارە، کە لە راست ئەوشتەی باسی لێوە دەکات گوایە لێی بێئاگایە، لە راستیدا لێی بێئاگا نییە، بەڵام بۆ مەبەستێکی تایبەت خۆی هەڵەدەکات.

## گردکردنەوە:

(گردکردنەوە) لە عەرەبیدا (العقد)ی پێدەگوترێت. بریتییە لە دارِشتنەوەی پەخشان بە شیعر، با ئینجا لەم پێناوەشەدا، وشەکانی دەقی یەکەم کەم یان زیاد بکەن، چونکە گرنگ ئەوەیە هۆنراوە تازەکە هەمان واتاکانی پەخشانەکەی بناغەی بەخۆوە گرتبێ.. بۆ وێنە:

ـ (هۆشی نایەتەوە بەرخۆی، تا ئەو رِۆژەی سەر ئەکاتە سەر بەردی ئەلحەد، ئەو وەختە تێ دەگا، کە تا لە دنیادا بووە، مردوو بووە، چونکە بێئاگا بوو لە ئیشی چاکە).

ئەو پارچە پەخشانە، (صەفوەت)ی شاعیر دێت و بەم شێوەیەی خوارەوە، دەیکاتەوە بناغەی شیعرەکەی خوارەوەی:

ـ ئەو وەختەی کەوا لە دنیادا بوو<br>
لە رِاستی چاکە مردووێك بوو، زیندوو<br>
ئەو رِۆژەی داینا، سەر لەسەر ئەلحەد<br>
بۆی دەرکەوت کەوا زیندووێکە مردوو<br>
بەڵام بێ کەڵکە، زیندوێتی ناو خاك<br>
زیندوو چاکەیە، تا نەبووە مردوو... صەفوەت

دەبینین هەمان ئەو واتایانەی پەخشانەکەی سەروو، بەخۆیان دەگرت، لەو پارچە هۆنراوەیەدا شاعیر گردیکردۆتەوە، بە ئاواز و پیزێکی تازە دایڕشتۆتەوە، بەمەش دەڵێن (گردکردنەوە).

ـ وەختی تەشریفی جەنابی مستەفا
ئەهلی شاری دیتییان زەوق و صەفا
فەخری عالەم وا لە بۆ دنیایێ هات
هیچ نەما تاریکی ئەمڕۆ ڕۆژهەڵات
هات لە مابەینی بتان دەنگ و سەدا
تەرك بکەن ئەصنامی لێیان بن جودا
ئاوی شاری (ساوە) ئەو ئاوی عەجیب
غەوری عاردی بوو ئەوێ شەو زۆر غەریب!!
هەر ڕەئیسێکی هەبوو گەورە و گران
لاڵ و کەڕ کەوتن ئەوێ شەو بێ زمان
پارچە پارچە تاقی کیسرا شەق دەبوو
جێ بە جێگای جوملە کافر لەق دەبوو
ئاتەشی ئاتەشپەرست وەختی سەحەر
وا کوژا تێکچوو نەما شوعلە و ئەسەر
هات مەلائیك چین بە چین دایان سەلام
هەم دەیانکرد بەینی خۆ قصەو کەلام... ڕەشاد موفتی

ئەم پارچەیە گردکردنەوەی ئەو پەخشانە واقیعییە مێژوویییەیە، کە باس لەو ڕووداوانە دەکات، کە لە ساتی هاتنە دونیای پێغەمبەری خۆشەویستمان (درود و سڵاوی خوای لەسەر لێرەو لەوێ وەکو نیشانەی هاتنی سەرەتایەکی نوێ لە دیندارییدا ڕوویاندا. شاعیر گردیکردوونەتەوەو بە شیعر دایڕشتۆتەوە.

ـ بۆت بەیان کەم چۆن چووە ئاسمان نەبی
گوێ بدە ئەی ئەهلی دین شوبهەت نەبی
هەر کەسێ ئینکار بکا ئەم قصەیە
فاسقەو کەم دین گوناهی گەورەیە

هەیبوو ئەو نازداری عالەم وەقتی خاص
بەحسی میعراج زاهیرە لای عام و خاص
هات بە شەو بۆ لایی ئەحمەد جوبڕائیل
خوا سەلامت لێ دەکاتن ئەی خەلیل
موژدە بۆ تۆ ئەی نەبییی موحتەرەم
بۆ سەما دەعوەت دەکا ڕەببول ئومەم
وا ڕجا دائیم دەکەن جوملەی مەلەك
تۆ بچی بۆ سەیری ئاسمان و فەلەك
با بچین ئەی مەفخەری میسر و عیراق
وا لە دەرگا حازرە تاج و بوڕاق
چوو لە بۆ سەر بیری زمزم دابەزی
بەم قصە کافر هەموو جەرگیان تەزی
غوسلی کرد تازە، هەمین شوشتی دەستنوێژ
سرڕی وا کو تێدەگاتن قەومی گێژ؟!
حەمد و شوکری خوایی گەورەی کرد تەمان
بۆ قودس ڕۆیی شەوێ خەیرولئەنام
عەرزی کرد ئەرواحی جوملەی ئەنبییا
خوا موبارەك کا مەقامت مستەفا
قامەتی کرد جوبڕائیل هەینێ لەوێ
پێش نوێژی کرد ئەحمەد بەو شەوێ
هەم لە ئەصنافی مەلائیك زۆرییان
خوا موبارەك کا مەقامت گۆتییان
هات تەواو بوو گفتوگۆ و قصصە و کەلام
بۆ سەما ڕۆیی بە توند گرتی لیجام
زین کرا حازر بوو ئەو دەم لۆی بوڕاق
هات سووار بوو چوو لە بۆ سەبعول تیباق
زۆر عەجیب سەیری سەماواتی دەکرد

خوا بەوی لوتف و عینایاتی دەکرد
دۆزەخی دی هەم بەهەشتی ئاشکار
ئەحمەدی مەحبوبی خوای پەروەردگار
فکری کرد بڕوا لە سیدرەش تێپەڕی
کەس نەما هەینێ ببێتە ڕەهبەری
ئەمری کردە جوبڕائیل نوڕول بەصەر
با بچین ئێستا لەگەڵ من بۆ سەفەر
عەرزی کرد دەیگۆ جەنابی موقتەدا
سیدرەیە بۆ من لە ئاسمان مونتەها
سیدرەیە جێگەم ئەمن ئەی زو کەرەم
تێپەڕم لێرە دەسووتێم لا جەرەم
غەیری تۆ هەورازی سیدرە هیچ کەس
ناوێرن نێزیك بن، بشکەن هەوەس
ئەو دەمی دەیکرد لەگەڵ جبڕیل کەلام
دیتی ڕەفرەف هاتە خدمەت دای سەلام
فەرموو تەشریفت بچێ لای حەزرەتی
با بڕۆین تا بارەگایی قودرەتی
چوو لە بۆ عەرشی لە سیدرەی کرد عورووج
ما لەوێندەر ڕەفرەفی زاتول سورووج
پێیی ڕاستەی خۆی کە هاویت با صەفا
هەینێ زانی سرڕو مەعنای ئستەوا
ئەمری پێکرد هەینێ ئەو خوایی جەلیل
هیچ دەبێ ترست نەبێ تۆ ئەی خەلیل... ڕەشاد موفتی
ئەمەش گردکردنەوەی ڕووداوی ئیسراو میعراجە کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتووەو بە پەخشان کە لە کتێبەکانی سیرەدا داڕێژراوە، شاعیر گردیکردۆتەوە و کردوویەتییە شیعر.
ـ خەدیجە قەڵس بوو لە کار تەشقەڵە
پێی خۆش بوو ڕاس بێ سەوداو مامەڵە

لە هەقی خەڵكی قەت نەبوو تەمای
ئەو ماڵە زۆرەش كە كەوتبووە لای
بۆ كوت فرەی خۆی هەوڵی نەدابوو
ئیرسی چەند كەس بوو بۆی بەجێمابوو
لە پاكی ئەحمەد كە ناویان ئەبرد
لە دڵی پاكی زۆر كاری ئەكرد
فكری كرد بە خوا ئێژم لەمەولا
بسپێرمە ئەو مامەڵەو سەودا

❊ ❊ ❊

ناردی بۆ ئەبوتالب پەیغامێ
ئەوا كاروانم دەچێ بۆ شامێ
ئەگەر رێككەوێ ئەحمەد بنێری
پێم خۆشە كاروان بە ئەو بسپێری
ئەبو تالب و محەمەد هەردوو
بەم سفارشە زۆر دڵیان خۆشبوو
كاروان كەوتە رێ كاروانی دا جوین
بە سەركردەیی ئەحمەدی ئەمین
قافڵەچی جاران بەر لەم سەفەرە
خزمەتكارێ بوو بەناو (مەیسەرە)

❊ ❊ ❊

ئەمجار خەدیجە ناردی بەو بۆنە
بزانێ رەفتار محەمەد چۆنە
بێدەنگێ پێی وت: بە نادیاری
سەرنج دە لە خەرج لە سەوداو كاری
داخۆم بەجێ وا باش ئەكەن باسی
ناوی دەرچووە بە پاكی و راسی
داخۆم گەر دەسی بكەوێ پارە

به لێشاو هێشتا ئەمانەتدارە؟

کاروان هاتەوە زووتر لە جاران

کەچی نەفعیشی هێشتا ئەیدا بان

❊ ❊ ❊

لەبەر سەر ڕاسی مامەڵەیان زوو

تەواوی خەرجی کاروان کەم دەرچوو

مەیسەرە هەر چەن تۆزێ دڵمەن بوو

کە سەر کاروانی لە دەسی دەرچوو

بەڵام ئەخلاقی قافڵەچی تازە

ماتی کردبوو زیاد لە ئەننازە

لە جێی حەسوودی، یان قین لێکردن

یا (داخی قەسەم بە بوت نەخواردن)!

سەرسام بوو دڵی سەد دڵ حەیرانی

فریفتەی قسەو ڕەفتاری جوانی

❊ ❊ ❊

هەر لە دوور قافلە گەییە نزیك شار

تەقەڵکووت ڕایکرد بۆ لای خاوەن کار

هیچ ئاگای نەبوو شەکەت و ماندوو

کۆچ و کاروانی هەر لە بیر نەبوو

بێ چاکە و چۆنە بەبێ وچان دان

ملی نا باسی چاکەی سەرکاروان

خانم لە ڕاسی و پاکی ئەم لاوە

چیتان بیستووە! هەر ناتەواوە!

سوێن بە مەنات و لات و عوززا بێ

بە ڕاسی باسی هەر تەواو نابێ!!!

❊ ❊ ❊

من لە ئەووەڵەو زۆرم پێ تاڵ بوو

که سەرکاروانی چەنای چەن ساڵ بوو

بە من بوو ئەو لێی سەندم بە ڕاسی

گەلێ کرمۆل بوو دڵم لە حاسی

بەڵام خوا ڕاسە و ڕاسی پێ خۆشە

بەشی زۆر زۆرە لە هەرچی بەشە

خۆ پێم ناکرێ خۆ لە هەق لادەم

ئەوەی دیومە کەس نەیدیوە وە چەم!!! ئەحمەدی موفتی زادە

ئەم پارچە شیعرە بەشێکە لە ڕووداوی چۆنیەتی دەستنیشانکردنی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر)، لە لایەن خاتوو خەدیجەی دایکی ئیماندارانەوە (ڕەزای خوای لێبێ)، بۆ ئەوەی ببێتە سەرقافڵەی کاروانە بازرگانیەکەی و بەرەو شام بچێ و ئیتر لەم کارەوە، چۆن زیاتر جوانییەکانی ڕەوشت و خووی بەرزی حەزرەت (درود و سڵاوی خوای لەسەر) وە دەردەکەوێ و چۆن ناحەزێکی وەکو (مەیسەرە)ش کە بە هۆی حەزرەتەوە کارەکەی لە دەستچووە، کە پێشتر خۆی سەرقافڵەی کاروان بوو، بەڵام دوای ئەم سەفەرە هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ بە دڵ حەزرەتی حۆش بوویت و بە دڵسۆزییەوە شایەدی بۆ باشی و چاکی و ڕەوشتە بەرزەکانی بدات. ئەمە لە کتێبەکانی سیرەدا بە درێژی هەیە، شاعیر وەریگرتووەو لەم شیعرەیدا گردیکردۆتەوە.

### هەڵوەشاندنەوە:

(هەڵوەشاندنەوە) لە عەرەبیدا (الحل)ی پێدەگوترێت.. هونەرێکە تەواو پێچەوانەی (گردکردنەوە)یە، بریتییە لە داڕشتنەوەی هۆنراوە بە پەخشان، کە بە هەمان شێوەی گردکردنەوەکە، گرنگ نییە لەو گۆڕانکارییە، هەندێ وشە و ئامراز کەم، یان زیاد بکەن، بەڵکو گرنگ ئەوەیە، واتای هۆنراوەکە بە باشی وەبەر پەخشانەکە کرابێت، بۆ وێنە:

ـ من و تۆ پێکەوە، با ئاشنابین

وەکو پەروانە و شوعلەی چرابین... قانیع

ئەم دێڕە شیعرە دەبینین، ئەدیبێك هێناویەتی کردوویەتییە بناغە بۆ پارچە پەخشانێکی، بەم شێوەیەی لە پەخشانەکەی خۆیدا هەڵیوەشاندۆتەوە:

(چۆن پەپوولە - وێنە گەردانەی مرواری دەوری مل- دەسوڕێتەوە، بە دەوری چرادا، توخوا بامن و تۆیش بەو جۆرە بین.. من پێم خۆشە پەروانە بم، توخوا تۆش پێت خۆشبێ، با چرای من بیت).

نموونەیەکی تر لەم بارەیەوە:

ـ سەری نامەم بە ناوی تۆ خودایە

کە بێ ناوی تۆ نامە بێ نەوایە

خوای تەنیای دیار و نادیاران

خوای میر و بەلەنگاز و هەژاران... هێدی

ئەدیبێکی تر ئەم پارچەیە لە پەخشانێکدا هەڵدەوەشێنێتەوەو بەم شێوەیەی لێدەکات: خوایەگیان.. ئەی خوای تەنیای ئەوانەی دیارن و هەموو ئەوانەشی نادیار، لەوانەی کە هەر نەماون، یاخود هێشتا نەهاتوون.. خوای میر و فەرمانڕەوایانی زل، خوای فەقیر و هەژارانی ناسك دڵ.. ئەوا نامەم بە ناوی تۆ دەنووسم، چونکە گەرنا دەزانم پووچە هەوڵم.

## روونکردنەوە:

(روونکردنەوە) لە عەرەبیدا (التفسیر)ی پێدەڵێن.. بریتییە لەوەی شاعیر، یان نووسەر دوای ئەوەی باس لە شتێکی دیاریکراو دەکەن، دواتر پرسیار بۆ شتەکە دروست دەکەن و بە وەڵامی پرسیارەکە شتەکە چاکتر روون دەکەنەوە، بۆ تێگەیشتنی بەرامبەر.. بۆ وێنە:

ـ بەسەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم

شریتی عومری ڕابردووم وەکو خەو دێتە بەر چاوم

شریتی چی سەراپا سەرگوزشتەی نائومێدیمە

فلیمی پڕ لە ناسۆری هەرەسهێنانی لاویمە... ئەحمەد هەردی

لە دێڕی یەکەم نیوەی دووەمدا باسی لە شریت کردووە، لە دێڕەکەی دواتر دەپرسێك شریتی چی؟ ئینجا هەر خۆی وەڵامدەداتەوەو شتەکە روون دەکاتەوە.

ـ چڵ ساڵ تێپەڕی زەمانی ماندوو

لەو ساڵەی مەشهور بە عامولفیل بوو

زەمان چ زەمان سەنگین بۆ هەژار

وەك تەوقی زاڵم، تاڵ وەك ژەهری مار... ئەحمەدی موفتی زادە

له دێڕی یەکەم شاعیر باس له زەمانی بەر له دەرکەوتنی ئیسلام دەکات، دواتر دێت پرسیار دەکات بزانیٚ ئەم زەمانه چ زەمانێك بووە، ئینجا وەسفی دەکات که چۆنی بلێی وەها تاریك و تار بووە، ئەوەش روونکردنەوەیه.

**شێوازەکانی روونکردنەوە:**

روونکردنەوە به چەند شێوازێك دەبیٚ، لەوانه:

١ـ که له نێو دێڕدا وشەیەك، ناوێك، زاراوەییێك دێت، یەکسەر دوای ئەو ئەو وشەیه شیبکرێتەوەو واتای مەبەستی بخرێتەروو، بۆ نموونه:

ـ دەیگۆ تەشریفی که هات شاهی جیهان

یەعنی ئەو پێغەمبەری ئاخر زەمان... رەشاد موفتی

دەبینین، که له نیوە دێڕی یەکەم وشەی شاهی جیهان هاتووە، یەکسەر دوا به دوای ئەوە، روونکراوەتە، که مەبەست له شاهی جیهان کێیه، بۆ ئەوەی پایەی پێغەمبەر (درود و سلاّوی خوای لەسەر) که مەبەستەو ئەو پایەیه هی ئەوە، بەهەڵە زەین بۆ یەکێکی دیکەی نەبات.

٢ـ ـــ مەی لەبەر دەم بیٚ، که ئیمرۆ عادەتێکی جارییه

عادەتی چی؟ موئنیسی چی؟ پیشەیی بێکارییه... دڵدار

لەم دێڕەدا، دوای ئەوەی شاعیر باس له کوڕی مەی نۆشی دەکات و دەڵێت، ئیمرۆ عادەتێکی پیادەکراوە، به ناوخەڵکانێك دانیشتنەکانیان بەبیٚ (مەی) به ناتەواو دەبینن. له نیوە دێڕی دووەم دێت دوو پرسیار بۆ (عادەتەکه) دروست دەکات، یەکەمیان (عادەتی چی؟)، که ئەمە پرسیارە له خودی عادەتەجارییەکه، که له نیوە دێڕی یەکەمدا، باسی لێوەکراوە، دووەمیش (موئنیسی چی؟) واته: خەمڕەوێنی چی؟ که ئەمە له دێڕەکه باس نەکراوە، بەلاّم بیانووی خەڵکه مەینۆشەکانه، بۆ مەی نۆشینەکەیان.. ئینجا پاش ئەم پرسیارانه، راستییەکه روون دەکاتەوە، که مەینۆشی نه عادەتە و نه بۆ هاودەمی و خەمڕەوێنیش سوودێکی هەیه، بەڵکو پیشەی کەسانێکی بێکارە، که بێئاگای هەموو کاروبارێکن.

**وەرچەرخان:**

(وەرچەرخان) بەو دەربڕینه دەگوترێت، که تیایدا شاعیر سەرەتا باس له شتێك بکات، بەلاّم که له درێژەی باسەکەیدا دەگاتە شتێکی تایبەتی، له لاباسەکەی یەکەمی وەردەچەرخیٚ

و باس له شته تازه‌که ده‌کات.. بۆ وێنه:

ـ شیوه‌نی من شیوه‌نی ئینسانی یه
بانکی ئازادی و گڕۆی یه‌کسانی یه
شیوه‌نی من شینی کوردی بێبه‌شه
ئه‌و گه‌له‌ی حاشا ده‌که‌ن، لێ ی و هه‌شه.. هێمن

له‌و پارچه‌یه‌دا سه‌ره‌تا شاعیر باس له شیوه‌نی خۆی ده‌کات، به‌ڵام کاتێـك لـه درێـژه‌ی باسـی شیوه‌نه‌که‌ی ده‌گاته سه‌ر (کورد)، له باسه‌که‌ی خۆی وه‌رده‌چه‌رخێ، دێت ئه‌مجاره‌یان باسی کورد ده‌کات، که میلله‌تێکه، گه‌لێکـه حاشـای لێده‌کـه‌ن و هه‌شـه.. ئه‌مـه‌ش (وه‌رچـه‌رخانه) لـه باسێکه‌وه بۆ باسێکی تر.

## جیاکردنه‌وه:

(جیاکردنه‌وه) بریتییه له خستنه‌ڕووی شتێك به په‌سنێکی گشتی، ئینجا دواتر له په‌سنێکی تایبه‌ت، شتێکی تر به سه‌ر شته‌که‌ی پێشوو، زه‌قبکرێته‌وه، مه‌به‌ستیش له‌مه جیاکردنه‌وه‌ی دۆسیه‌کان بێ.. بۆ وێنه:

ـ عه‌ره‌ب ئینکاری فه‌زلی ئێوه ناکه‌م، ئه‌فزه‌لن ئه‌مما
سه‌لاحه‌دین، که دنیای گرت، له زومره‌ی کوردی بابان بوو... شێخ ره‌زا

له‌م دێڕه‌دا، شاعیر سه‌ره‌تا هاتووه، به شێوه‌یه‌کی گشتی په‌سنی میلله‌تی عه‌ره‌بی داوه، ئه‌وه‌ی ده‌رخستووه، که ئێوه‌ی عه‌ره‌ب له گه‌لانی تر باشترن و چاکه‌تان به‌سه‌ر هه‌مووانه‌وه هه‌یه، من لاملێیی له‌وه ناکه‌م، ئه‌وه‌ش به هۆی بوونی ئاینی ئیسلام و پێغه‌مبه‌ر (درود و سلاوی خوای له‌سه‌ر) یه‌که‌مجار له ئێوه، به‌ڵام پاش ئه‌وه شاعیر هاتووه ئه‌مجاره‌یان به شێوه‌یه‌کی تایبه‌ت سه‌لاحه‌دینی گه‌وره سه‌رکرده‌ی کورد و جیهانی ئیسلامی جیاکردۆته‌وه، ئینجا هه‌ر رووی ده‌می له عه‌ره‌به‌کان ده‌کات و پێیان ده‌ڵێ، به‌ڵام ده‌بێ ئاگاداری ئه‌وه‌ش بن، که پێشه‌وایه‌کی مه‌زنی وه‌کو سه‌لاحه‌دین، که له‌سه‌ر ده‌ستیدا ئه‌م هه‌موو سه‌رکه‌وتن و سه‌رووه‌رییه بۆ جیهانی ئیسلامی و سه‌رجه‌م موسڵمانانی جیهان تۆمارکران، کوڕه کوردێکی قاره‌مانی کوردستان بوو، به‌مه‌ش شاعیر دۆسیه‌ی چاکه و سه‌رووه‌رییه‌کانی هه‌ردوو میلله‌تی کورد و عه‌ره‌بی سه‌رکه‌وتووانه لێك جیاکردۆته‌وه.

**چەند نموونەیەکی (جیاکردنەوە):**

ـ ئەوەی تۆ هەتبوو، من نەمبوو: قەرار و صەبر و عیززەت بوو

ئەوەی من هەمبوو، تۆ نەتبوو: وەفاو میهرەبانی بوو.. حاجی قادر کۆیی

لێرەدا، شاعیر بۆ جیاکردنەوەی دۆسیەی خۆی و بەرامبەرەکەی، لە نیوە دێڕی یەکەم، بە شێوەیەکی گشتی بەرامبەرەکەی بە وشەکانی (قەراو صەبر و عیززەت) پەسن دەدات، خۆی جیادەکاتەوە لەوەی ئەو سیفەتانەی وەك بەرامبەرەکەی هەبێ، بەڵام لە نیوە دێڕی دووەم: ئەمجارەیان بە شێوەیەکی گشتی، بە وشەکانی (وەفاو، میهرەبانی) پەسنی خۆی دەدات و بەرامبەرەکەی جیادەکاتەوە لەوەی ئەو سیفەتانەی هەبێ.

ـ کەس نەماوە، بە غەیری کاك ئەحمەد

شەیخی مەعروف و، عالیمی ئەرشەد... حاجی قادر کۆیی

لەم دێڕەدا، سەرەتا شاعیر پەسنێکی گشتی کە (نەمان)ە، بەسەر دانیشتوانی کوردستاندا دەدات، دەڵێت: لە زاناو خزمەتکارانی گەورەی ئایین، بەداخەوە کوردستان کەسی تیا نەماوە، بەڵام دواتر دێت و بە هۆی ئامرازی جیاکردنەوەی (غەیری)، (کاکە ئەحمەدی شێخ) جیادەکاتەوە، کە ئەم زانایە بەر پەسنە گشتییەکە ناکەوێ و بە راستی شێخێکی ناسراو و زانایەکی سوودمەندە.

ـ گوتم: کەوابێ ئاشنا

بەشی ئێمە لە نێوچوونە

گوتی: نا، نا، دوور بنوارە

دوور بنوارە، ئاسۆ ڕوونە.. هێمن

لەم چوارینەدا، سەرەتا شاعیر بە بەرچاوگرتنی ئەوانەی دەیانزانێت، بڕیارێکی گشتی بەسەر ئایندەدا دەدا، وا دەزانێ لەنێوچوون هەرەشەیان لێدەکات، ئەوەش عەرزی بەرامبەرەکەی دەکات، بەڵام بەرامبەرەکەی تروسکە هیوایەکی لە ئەو زیاتر بەدی دەکات، ئەگەرچی ئەویش تا ئەو ساتەی وەڵامی شاعیر دەداتەوە، دڵنیابێ لەوەی، کە لەنێوچوون و فەوتاندن هەرەشەیان لێدەکات، بەڵام بۆ ئایندەیان (ڕوونی ئاسۆ) بە خاڵێکی بەهێز دەبینێ، لێرەدا دێت ئایندە بەو هیواو تروسکەی ئومێدەوە لە رابردوو جیادەکاتەوە.

**هێماکەر:**

(هێماکەر) لە عەرەبیدا (الارصاد)، یان (التسهیم) و (التوشیع)یشی پێدەگوترێت، ئەگەرچیش هەبێ جیاوازی لە نێوان ئەم دووانەی دواییش کردبێ.. بریتییە لەوەی لە دەربڕیندا شتێکی وا پێشبکەوێت، کە دەلالەت لەسەر بەشەکەی دوایی دەکات، ئەمەش جارێ بە واتاو، جارێ بە وشە. بە واتایەکی تر: شاعیر، یان نووسەر لە دەربڕینەکەی خۆیدا چ بە واتا، چ بە وشە، کە بەشی یەکەمی قسەکەی دەکات، هێشتا بەشە دووەمەکەی قسەکەی نەکردووە، بەڵام خوێنەر تێدەگات، یان بیری بۆ دەچێت، کە ئێستا بەو شێوەیە دەبێ کۆتایی بە قسەکەی بێنێ.. بۆ وێنە:

ـ مردنێکی لەبەر ئەو قاپییەدا مەردانە

بە خودا چاترە ئەمڕۆ، لە گلاراوی حەیات... مەحوی

لەم دێڕەدا، کاتێك شاعیر لە بەشی یەکەمی دەربڕینەکەی ئاماژە بەوە دەکات، کە مردنێکی مەردانە لەبەر ئەو قاپییەدا چاترە، بە وشەکانی (مردن ـ چاترە) ئەگەرچی هێشتا شاعیر قسەکەی تەواو نەکردووە، بەڵام خوێنەر زەینی بۆ ئەوە دەڕوات، کە ئەو وشەی لە بەشی دووەمدا شاعیر دەیهێنێت، دەبێت وشەی (ژیان) بێت، چونکە بەراوردی (مردن) بە (ژیان) دەکرێت، ئەمانە وەکو دوو وشە دژو بەرامبەری یەکن، کە شاعیریش گوتەکەی تەواو دەکات دەبینین، ڕێك بەراوردی مردنە مەردانەکە، لەگەڵ (گلا راوی حەیات) دەکات، کە یەکەمیان لە دووەمیان چاکترە.. کە واشبێ ئەوەی خوێنەر بۆی چوو، ڕاستبوو (حەیات)یش هەر عەرەبییەکەی (ژیان)ە.. ئەم چەشنە دەربڕینەش ئێمە ناوی دەنێین (هێماکەر)، وەك لە سەرووش ئاماژەمان بۆ کرد، کە عەرەبەکان چ ناوێکیان بۆ بەکارهێناوە.

ـ بەم کەلامە لە ویجد و حاڵەتام

گەهـ بە هێواشی و گەهـ بە خرۆشم... حەمدی

لە نیوە دێڕی دووەمدا، کە کراوەتە دوو کەرت، دیارە کەرتی یەکەمی بە هۆی وشەی (گەهـ)ەوە بووەتە هێماکەر بۆ ئەوەی لە کەرتی دووەمی هاتووە، ئەوەش لە شیعری کوردیدا بە زۆری بەرچاو بکەوێت.

ـ گەهـ لەگەڵ سالیکانی مەسجیددام

گەهـ لە مەیخانە مەست و سەرخۆشم... حەمدی

لەم دێڕەدا نیوە دێڕی یەکەم بە وشەی (گەھ) کە لە سەرەتای نیوە دێڕەکە بەکاری هێناوەو دەڵێت: (گەھ لەگەڵ سالیکانی مەسجیددام)، هێما بۆ ئەوە دەکرێت، کە لە نیوە دێڕی دووەمدا باس لە کارێك بکرێت، پێچەوانەی مزگەوت و سالیکانی مزگەوت بێت، چونکە (گەھ) لەو وشانەیە، کە هەمیشە ئەگەر بەکارهێنرا، دووبارە دەبێتەوەو جاری دووەمیش شتێکی پێچەوانەی ئەوەی بەدوادا دێت، کە لە جاری یەکەم بەدوایدا هاتووە، کاتێکیش کە نیوە دێڕی دووەم دەخوێنینەوە، دەبینین ئەمجارە باس لە (مەستی و سەرخۆشی مەیخانان) دەکات، بەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە راستی بۆ چووبووین و ئەوەی پێشبینیمان کرد لە هێماکەی نیوە دێڕی یەکەم، لە نیوە دێڕی دووەم وەدی هات.

## جۆرەکانی (هێماکەر):

گوتمان (هێماکەر) بەو دەربڕینانە دەڵێین، کە بەشی یەکەمیان، هێما بۆ بەشە دووەمەکەیان دەکەن، ئەمەش بە دوو جۆر چ بە واتا بێ، چ بە وشە، لە خوارەوە ئاماژە بۆ هەر دوو جۆرەکە دەکەین.

یەکەم: هێماکەری واتایی: ئەو دەربڕینەیە، کە واتای بەشی یەکەمی، هێما بۆ ئەو گوتەیە دەکات، کە لە بەشی دووەمیدا دێت، بۆ وێنە:

ـ نەوەك هەرچاوی مەستە، خۆشی هەر مەست

بەلادا دێ، کە دێ، وەك تورکی سەر مەست... مەحوی

لێرەدا، لە بەشی یەکەمی نیوە دێڕی یەکەمدا، کاتێ شاعیر پەسنی بەرامبەرەکەی دەدات بەوەی کەوا: (نەوەك هەرچاوی مەستە)، هێشتا گوتەکەشی تەواو نەکردووە، بەڵام واتای ئەو بەشی یەکەمی قسەیەی، زەینی گوێگر، یان خوێنەر بۆ ئەوە دەبات، کە ئێستا باس لە مەستی زیاتری بەرامبەرەکەی بکات، چونکە گوتەکەی ئەوە لە بیردا دروست دەکات، کە لەگەڵ ئەو کەسەی لە شیعرەکەیدا رووی تێدەکات، دەیەوێت، پێی بڵێت: براکەم کە تۆ باس لە مەستی چاوی دەکەی، ئەوا من مەستیم هەر تەنیا لە چاوی نەدیوە، بەڵکو بیستومە، مەستییەکەی لەوە زیاتر بووە، بۆیە خوێنەر چاوەڕێ دەکات کە ئێستا دەبێ باس لە مەستییەکی زیاتر بکات، جا کە گوتەکەشی تەواو دەکات (خۆشی هەر مەست) ئینجا گوێگر یان خوێنەر دڵنیادەبێ، کە بە هەڵەنەچووە و چۆنی بۆچوو، وابوو.

دووەم: هێماکەری وشەیی: ئەو هێماکەرەیە کە یەکێ لە وشەکانی بەشی یەکەمی دەربڕینەکە، لە مێشکی گوێگر یان خوێنەری دروست دەکەن، کە ئەو گوتەیەی بەشی دووەمیش دەبێت لەسەر هەمان کێشی گوتەکەی بەشی یەکەمی دەربڕینەکە بێ، بۆ وێنە:

ـ تاڵەبانی زۆرن ئەمما، هەردووانیان دێنەکار
ڕۆژی دەعوا شێخ حەمید و ڕۆژی حەلْوا شێخ ستار ... شێخ ڕەزا

لە نیوە دێڕی دووەمی ئەم دێڕە، دەبینین، بەشی یەکەمی دەربڕینەکە، کە دەڵێ (ڕۆژی دەعوا شێخ حەمیدو) یەکسەر زەینمان بۆ ئەوە دەچێت، ئێستا ئەو گوتەیەی بە دوایدا دێت، لەسەر هەمان کێشی (ڕۆژی دەعوا)یە، چونکە شاعیر نیوە دێڕەکەی لە ناوەڕاست کەرتکردووەو ئاوازی دێڕەکە، ئەوە دەخوازێ، کە ئێستا وشەی (ڕۆژی...)یشی بەدوادا بێت، کاتێکیش گوتەکەی تەواو دەکات و دەڵێت: (ڕۆژی حەلوا شێخ ستار) ئینجا دڵنیا دەبین، کە لە بۆ چوونەکەماندا ڕاست ڕۆیشتووین و بەهەڵەدا نەچووین.

ـ خۆم ناکەم بە بار بەسەر کۆمەڵدا
گەر بار سووك نەبم؟ بۆ بارگران بم... برژاو

بەشی یەکەمی نیوە دێڕی دووەم، کە بە ئامرازی مەرجی (گەر) دەست پێدەکات و دەڵێت: گەر بار سووك نەبم؟ ئەمە دەبتە هێماکەر بۆ ئەوەی بەشی بەدوا داهاتووی ئەوە بۆ (بار گران بم)؟ بێ.. کە شاعیریش دێڕەکەی تەواو دەکات، ڕاستی بۆچوونەکەمان بۆ بەدەر دەکەوێت.

### شێوازەکانی (هێماکەر):

١ـ دەشێ شاعیر لە بەشی یەکەمی گوتەکەی باس لە نەبوونی شتێك بکات لای بەرامبەر، بۆ نموونە بڵێت: (کە تۆ نەداری بە تۆ چی...) یەکسەر و بەر لە تەواو کردن، خوێنەر تێدەگات، ئەوەی بە دوای بەشی یەکەمدا دێت، دارایی یەکێکی ترە، چونکە واتاکەی بەشی یەکەمی گوتەکە هەر ئەوە هەڵدەگرێت، بۆ وێنە:

ـ فەزیڵەی ئەصل و فەصل ئینسانی پێ نابێ، بە صاحێب فەزڵ
کە تۆ کۆسەی بە تۆ چی مامە، ڕیشی باب و باپیرت... مەحوی

لە نیوە دێڕی دووەمدا، دەبینین، دوای ئەوەی لەبەشی یەکەمدا دەڵێت: (کە تۆ کۆسەی بە تۆ چی مامە)، یەکسەر لە زەینی خوێنەر ئەوە دروست دەبێت، لە بەشی دووەمی گوتەکە،

باس لە ریشی یەکێکیتر بکات، چونکە کە (کۆسە) خۆی ریشی نەبێ، هەر ئەوە هەڵدەگرێ پێی بڵێین ریشی خەڵکانی تر بە تۆچی و دادت نادات، بۆیە کە نیوە دێڕەکە تەواو دەکات، بۆمان دەردەکەوێت، کە بە راستی بۆ دوابەشی گوتەکە رۆیشتووین.

٢ـ کە لە نیوە دێڕی یەکەم باس لە شتێکی دیاریکراو دەکات، بە باشتر، یان چاکتر، یان هەر پەسنێکی تری وەسف دەکات لە پلەی بەراوردی سیفەتدا، یەکسەر زەینمان بۆ ئەوە دەچێ، کە ئەو وشەیەی لە بەشی دووەم دێت، لە واتادا دژە واتای وشەکەی بەشی یەکەم بێت، بۆ وێنە:

ـ بەو هەموو تاڵییەوە شەربەتی مەرگ

خۆش گەواراترە بۆی، ئێستا لە شەکراوی حەیات... مەحوی

کە لە بەشی یەکەمی ئەو دێڕەدا شاعیر باس لەوە دەکات شەربەتی مەرگ لەگەڵ تاڵییەکەشی، بەڵام هێشتا گەواراترە، وا هەست دەکەین لێرەدا، (شەربەتی مەرگ)ەکەی، لەگەڵ (شەربەتی ژیان و حەیات) بەراورد کردبێ، چونکە بەرامبەری (مەرگ) هەر (حەیات)ە، بۆیە وای بۆ دەچین، کە ئەوەی لە بەشی دووەمی گوتەکەی ئاماژەی بۆ دەکات، دەبێت وشەی (ژیان)، یان (حەیات)ی تیابێت.. ئینجا کە قسەکەی تەواو دەکات، دەبینن، بۆ چوونەکەمان راست و دروست بووە.

# بەشی سێیەم
# جوانکاری تێکەڵ

ئەم بەشە بۆ یەکەمجارە من بۆ باسەکانی جوانکاری زیادی دەکەم، دەنا پێشە من نە لە بەلاغەی عەرەبی و نە لە رەوانبێژی کوردی، کەسی تر ئاماژەی بۆ نەکردووە، ئەوەش لەبەر ئەوەی ئەم دوو باسەی لێرەدا تیشکیان دەخەمە سەر، لە راستیدا هەردووکیان تێکەڵن لە هونەری وشەیی و هونەری واتایی جوانکاری و تەنانەت لە هونەرەکانی دیکەی رەوانبێژیش، لەبەرئەوەشە بەلامەوە دروست نییە، ئەم دوو هونەرە نە لەسەر یەکەم و نە لەسەر دووەمیش حیسێب بکرێ، بۆیە بەم شێوەیەم دابەشکرد.

**ئیقتیدا:**

ئەوەیە شاعیر لە دێڕەکانی خۆیدا شوونپێی داهێنانی شاعیرێکی پێشەخۆی هەڵگرێتەوە، ئەو چۆنی نووسیوە، ئەمیش بە هەمان شێوەی ئەو بنووسێتەوە، بەڵام بێگومان بە واتایەکی نوێ، چونکە ماوەی نێوان دوو شاعیرەکە، هۆکارە بۆ بەرەوپێشچوونی مەبەست لە یەکەمەوە بۆ دووەم.

ئیقتیدا بە گشتی سێ جۆری هەیە، یان شاعیر بە کێش و سەروا و وشەو دەربڕین و بە گشتی بە رواڵەتی شیعری شاعیرێك کارتێکراو دەبێت و دێت بە ئیقتیدا کردن بەم شیعرەی شیعرێکی هاوشێوە دەنووسێ، یان شاعیر بە ناوەڕۆکی شیعرێك کارتێکراو دەبێت و دێت شیعرێك بە هەمان واتا، بەڵام بە وشەو دەربڕینی جودا دەنووسێت، یانیش بە هەردوو لایەنی شیعرێك کارتێکراو دەبێت و دێت لە هەردوو رووەوە شوونپێی شیعرەکەی پێشەخۆی هەڵدەگرێتەوە، بەم شێوەیە ئیقتیدای واتایی و ئیقتیدای رواڵەتی و ئیقتیدای کۆی واتاو رواڵەت دروست دەبن، لە خوارەوە تیشك دەخەینە سەر هەریەکە لەم سێیانە.

**یەکەم: ئیقتیدای واتایی**

لێرەدا شاعیر بە واتایێکی جوانی شاعیرێکی پێشەخۆی کارتێکراو دەبێت، دێت بە هەمان واتای ئەو، وەلێ بە زیادییەك دێڕەکەی خۆی دەهۆنێتەوە، ئەم جۆرەیان رەوانبێژانی عەرەب

ناسیان لێکردووەو ناویان ناوە (حسن ألآتباع)، بە پێی سەرچاوەکان (أبن أبي ألأصبع المسري) لە کتێبی (تحرير التحبير) یەکەم ڕەوانبێژێکە ئاماژەی بەوە دابێت، ڕەوانبێژانی تری دوای خۆی هەموویان پێناسەکەیان هەر لەو وەرگرتووە، ئەو گوتوویەتی: ((ئەوەیە قسەکەر بێتە سەر واتاییێك، کە غەیری خۆی دایانهێناوە، ئیدی بە باشی بزانێ لەمەدا بەو پێیەی شیاوە شوونی بکەوێت، واتا بەوە شوونی بکەوێت کە مافی کەسی دواییە لە شوونکەوتنی کەسی پێشە خۆی، جۆرێك گۆڕانیش بکات، جا ئەمە بە کورتکردنەوەی دەربڕینەکەی بێت، یان کورتکردنەوەی کێشەکەی، یان ناسکترکردن و زاڵبوونی بەسەر سەرواکەی بێت، یانیش بە تەواوکردنی کەموکورتییەکی بێت، یان بە درێژەپێدان بە واتا تەواوەکەی بێت، یان بە جوانکردن و ڕازاندنەوەی بێت بە بەرگێکی جوانکاری، کە بە هۆیەوەی شیعر جوان و دڵگیر دەبێت و مافی بۆ دروست دەبێت)).. بۆ نموونە:

(حاجی قادری کۆیی) لە دوو دێڕیدا ئیقتیدا بە چەند دێڕێکی (ئەحمەدی خانی) دەکات و هەمان واتای ئەو دێنێتەوە، بەڵام بە زیادییەکی تر.. ئەوەتا ئەحمەدی خانی لە وەسفی نەتەوەکەی خۆیدا گوتبووی:

- هندی ژ شەجاعەتێ غەیورن
ئەو چەند ژ میننەتێ نەفورن
ئەڤ غیرەت و ئەڤ علووێ هیممەت
بوو مانعێ حەملێ بارێ میننەت
لەو پێکڤە هەمیشە بێ تفاقن
دایم ب تەمەڕڕوود و شیقاقن... مەم و زین

حاجی قادری کۆییش بەو واتایانە کارتێکراوەو هاتووە بە ئیقتیدا بە ناوەڕۆك و واتای ئەم بۆچوونانەی خانی لە بارەی کوردەوە ئەویش نووسیویەتی:

- هەموویان شێری بێشەن حاتەمی جوود
لە شەڕدا کێوی جودی و بەحری مەمدوود
وەلێکین فائیدەی چی هەرج و مەرجن
لە دەعوادا لەگەڵ یەکتر بە مەرجن... حاجی قادری کۆیی

لێرەشدا کە ئەم دوو پارچەیە بەراورد دەکەین، دەبینین هەمان واتا دووبارە دەکەنەوە، بەڵام بە دوو شێوازی جودا، کە وەکو گوتمان ئەوەش پێویستە و ئاساییە.

## دووەم: ئیقتیدای ڕوواڵەتی:



ڕواڵەت دیوی دەرەوە، یان ڕووخساری شیعرەکە دەگرێتەوە، ڕووخساریش پێکدێت لە وشەو دەربڕین و شێوازی دەربڕین و کێش و سەرواو مۆسیقای دەرەوەو مۆسیقای ناوەوەو هەموو ئەمانە، زۆرجار شاعیرێك هەر لە ڕێگەی ڕواڵەتەکەیەوە، کارتێکراوی شیعری شاعیرێکی دیکە بووە، دوای ئەوە هاتووە شیعرێکی لەسەر هەمان ڕواڵەت نووسیوە، بۆ نموونە:

ئەو شیعرەی نالی بۆ مەستورەی نووسیوە، بووەتە سەرمەشقێکی جوان بۆ حاجی قادری کۆیی، هێندە پێی کارتێکراو بووە، هاتووە لەسەر هەمان کێش و مۆسیقاو هەمان سەرواشەوە پارچە شیعرێکی پێنج دێڕی نووسیوە، دەبینین ئەو شیعرانە زۆر لێك نزیکن و هەمان مۆسیقایان هەیە، نالی گووتوویەتی:

مەستوورە کە حەسناو و ئەدیبە بە حیسابێ

هاتە خەوم ئەمشەو بە چ نازێك و عیتابێ

هات و گوتی عوقدەم هەیە قەت مومکینە وا بێ

هەر تۆ مەگەر ئەم موشکیلە حەلکەی بە جەوابێ

هەر مەسئەلە بکرێ کە بە تۆ شەرحی کرابێ

لایق نییە کەس دەخلی بکا چین و خەتا بێ... نالی

حاجی قادری کۆیی وەکو ئەوەی وەڵامی ئەم دووانە بداتەوە، مەبەست (نالی و مەستورە)یە، لەسەر هەمان کێش و سەروای ئەو شیعرەی نالی ئەویش شیعرەکەی خۆی دەنووسێت و دەڵێت:

ـ مەتنی کوتوبی ئەم دووە با شەرحی کرابێ

ئیشکالی ڕمووزی مەسەلەی قازیی مابێ

قازی هەرۆ سینەت سوپەری تیری قەزا بێ

وەك دینی ڕەوافیز بەدەنت بێ سەرو پا بێ

خۆت حاکمی ئەم مەسئەلەیە کەی دەبێ وا بێ

پیری وەکو تۆ ماهی هەبێ و ماکەری گا بێ... حاجی قادری کۆیی

کە لەم دوو شیعرانە ورد دەبینەوە، کاریگەری (نالی) بەسەر (حاجی)یەوە بە ئاشکرا دەبینین، کاریگەرییەکەش لە ڕووی ڕواڵەتەوەیەو ئەوەتا هەموو ئەوانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- هەردوو شیعر سەراوای مەسنەوییان بەکارهێناوە.

٢- هەردوو شیعر لەسەر کێشی عەروزی و بەحری (ڕەجەز) و (مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستف) هاتوونە.

٣- هەردووکیان یەك ئاواز و مۆسیقایان بۆ دروستبووە.

### سێیەم: ئیقتیدای کۆی واتاو ڕواڵەت

ئەو ئیقتیدایەیە کە تیایدا شاعیر ڕەچاوی هەردوو لایەنی واتاو ڕواڵەتیش لە شیعرەکەی پێشەخۆی دەکات و لەبەر زۆرکارتێکراویی پێی، دێت لە هەردوو لایەنەوە شوونی هەڵدەگرێت، ئیتر هەندێ وشەو دەستەواژە و کێش، یان سەروای، شیعرەکەی پێشەخۆی و هەروەها هەمان واتا، یان واتاییێکی نزیکی ئەویش دێنێت.. بۆ نموونە: حاجی قادری کۆیی لە سەرەتای هۆنراوەییێکیی گوتبووی:

ـ تاجی (بسم الله الرحمن الرحيم)

نامە سەر بۆ دەفعی شەیتانی ڕەجیم... حاجی قادری کۆیی

ئەمە لە هردوو ڕووی ڕووالەت و واتاش کاری لە (حەمدی) کردووە، ئیتر ئەویش وەکو (حاجی) هاتووە گوتوویەتی:

با بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێ بکەم

چونکە تینووی ڕەحمەتم دڵئاگرینم ڕەحمەتێ... حەمدی

دەبینین دێڕەکەی (حەمدی) لە هەردوو ڕووی واتاو ڕواڵەتیش ئەگەرچی جیاوازییەکی کەمی لەگەڵ ئەوەی (حاجی قادری کۆیی) هەبێت، بەڵام هەردووکیان لەیەك نزیکن و تارمایی یەکەم بە ئاشکرا لە دووەمدا بەرجەستەیە.

### چەند نموونەییێکی ئیقتیدا:

#### ١- ئیقتیدای حەمدی بە مەحوی

ـ چ بکەم نە ئەو کەسەم کە کەسم بێ لەلا بە کەس

نە گەیمە ئەو کەسە، ئەو من بکا بە کەس... مەحوی

(حەمدی)ش کارتێکراوبووە بەم دێڕەی مەحوی، بۆیە ئیقتیدای پێکردووەو گوتوویەتی:

ـ کەس نەبووە نیشە هیچ کەسی کە بێ لەلا بە کەس

ناکەس هەیە کە ناکەسی وەك خۆی بکا بە کەس... حەمدی

کە دوو شیعرەکان دەخوێنینەوە هەست دەکەین حەمدی ئیقتیدای بە مەحوی کردووە، بەوەی کەوا لەسەر نەزمی ئەو دێڕەکەی خۆی نووسیوە، تەنانەت هاتووە دێڕەکەی خۆی وەکو وەڵامێك بۆ ئەوەی مەحوی خستۆتە روو، ئەوەش کاریگەری مەحوی لەسەر حەمدی روونتر دەکاتەوەو دەریدەخات کامیان بە کامیانەوە ئیقتیدایان کردووە.

لە لاییێکی دیکەوە مەحوی گوتوویەتی:

ـ ئەو سییارۆزیی منە پۆشیویە عەیبی کەسان

ئاشکارە سەتری ئەحوالی گونەهکارانە شەو... مەحوی

(حەمدی)ش لەو بارەیەوە گوتوویەتی:

ـ کردەوەی دنیا کە هەر عەیبە دەبێ داپۆشرێ

پەردەییێکی موختەسەر خاسی بەسەردادانە شەو... حەمدی

دیارە لەم دێرانەدا هەریەکە لە ((حەمدی و مەحوی لەوە دەدوێن، کە شەو تاوانی گوناهباران دادەپۆشێ، لەلای حەمدی پەردەیەکی بەسەردادانە و لەلای مەحوی زیاتر قووڵبۆتەوەو رەشی شەو بە جوانی و رەسەنی دادەنێ)).

دیارە د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، لە (مەحوینامە)کەیدا بە درێژی باسی لە گەلێ رووی لێکچوونی نێوان حەمدی و مەحوی دەکات، بۆ نموونە لە بارەی غەزەلی (رۆژ)ەوە دەنووسێت: (گەر سەیری هەردوو غەزەلی مەحوی و حەمدی بکرێ، دیار دەکەوێ، کە هەردووکیان ستایشی رۆژ دەکەن و مەزنییەکەی دەستنیشان دەکەن، هەروەها ئاشکرا دەبێ، کە غەزەلەکەی حەمدی کاریگەری غەزەلەکەی مەحویی پێوەیە، لە دوو لایەنەوە:

أ ـ لایەنی رووخسار.. هەردوو غەزەلەکە لەسەر عەروزی عەرەبین و لە بەحری رەمەلی هەشت هەنگاوی مەقصورن، هەروەها دوا سەروایان رۆژەو پێش سەروایان مۆرفێمی (انە)یە.

ب ـ لایەنی ناوەرۆك.. حەمدی و مەحوی لە شیعرەکانیاندا بە دوای یارێکەوە وێڵن، بەرە بەرە ئەوینەکەیان بەرەو قووڵایی دەچێت و لە ناکاو بەرەو خۆشەویستی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خوای لەسەر) دەگوازرێتەوە) ، ئەگەر واشبێ کەوابێ ئیقتیدای حەمدی بە مەحوی لە رووی رووخسار و ناوەرۆك و شێواز و بیرەوەیە و سنوورێکی بەرفراوان دەگرێتەوە، نەك هەر لە سنووری دێڕ و دوو دێڕدا گوزارشتی لێبکرێت.

**٢ـ ئیقتیدای قانع بە حاجی**

لە دێڕێكی خۆیدا (حاجی قادری كۆیی) ستایشی خودای گەورە دەكات و بە زمانێكی شیرین و خۆش و بە رووخسارێكی ناوازە و جوان دەنووسێت:

ـ مەعلومە بۆچی حاجی مەدحت دەكا بە كوردی

تا كەس نەڵێ بە كوردی نەكراوە مەتحی باری... حاجی قادری كۆیی

(قانع)ی شاعیر كارتێكراو بووە بەو رواڵەت و واتایەی ئەم دێڕەی (حاجی قادری كۆیی) و هاتووە ئیقتیدای بەم بەیتەی كردووە، لەسەر هەمان كێش و هەمان ڕێ و شوێن و بە هەمان واتا، ستایشی خودای خۆی كردووە، نووسیویەتی:

ـ قانع بە زمانی كوردی، مەتحی خودای دەنووسێ

تا كەس نەڵێ بە كوردی نەكراوە وەسفی وەهاب... قانع

تەماشا دەكەین ئەم دێڕەی قانع و ئەو دێڕەی سەرووی حاجی تەواو وەكو یەكن و ئیقتیدای قانع بە حاجی زۆر بە روونی بەرجەستەیە.

**٣ـ ئیقتیدای بێخود بە شیعرێكی حاجی قادری كۆیی**

ـ تا گوڵی رووخساری تۆ وەك من هەزاری عاشیقە

راستی قەددت لەسەر سەروو سنەوبەر فائیقە... حاجی قادری كۆیی

بێخودی شاعیر (١٨٧٨ـ ١٩٥٦ز) ئیقتیدای بە حاجی كردووەو گووتوویەتی:

ـ تا لە من ئەو ماهی چاوبەخومارە خۆی ونكردووە

تیفلی دڵمی تووشی بیماری سەروو بن كردووە... بێخود

**٤ـ ئیقتیدای دڵدار بە حاجی**

حاجی قادری كۆیی گوتوویەتی:

ـ جۆشێك بدەن وەكو هەنگ، تەگبیر بكەن بەبێ دەنگ

ئەسبابی شەڕ پەیدا كەن، تۆپ و تفەنگ و هاوەن... حاجی قادری كۆیی

دڵداریش گوتوویەتی:

ـ تێكۆشە دایم هەر وەكو هەنگ بە

لە مەیدانی ژین ئامادەی جەنگ بە... دڵدار

دەبینین لێرەدا دڵدار وێنەی لە حاجی وەرگرتووەو هانی خوێنەری خۆی داوە وەکو هەنگ چالاکانە بکۆشێ و خەریکی خەبات و تێکۆشان بێت، ئەوەش وەرگرتنی وێنەو بیری حاجییەو ئیقتیدایەکی ئاشکرایە بە حاجی.

٥ـ ئیقتیدای عەونی بە حاجی قادری کۆیی

عەونی شاعیر زیاتر لە جارێك لە دیوانەکەی خۆیدا کاریگەری حاجی قادری کۆیی بەسەرەوە بووەو لە زیاتر لە شیعرێکیدا ئەو کاریگەرییەی دیارە.. بۆ نموونە لە دێڕێکیدا حاجی گوتوویەتی:

ـ لە تووشی خۆم بوو هەرچی تووشی خۆم بوو

لە دەستی خۆیەتی حاجی شکاتی... حاجی قادری کۆیی

عەونی بەم مۆسیقاو دەربڕینەی حاجی قادری کۆیی زۆر کارتێکراو بووەو هاتووە ئیقتیدای پێوە کردووە، ئەویش نووسیویەتی:

ـ هۆی چارەڕەشی نابێ لە بێگانە بزانم

ڕاستی ئەمەیە بێژە لە دەست خۆمە شکاتم... عەونی

لە لایێکی دیکەوە حاجی قادری کۆیی گوتوویەتی:

ـ دەزانی زەحمەتە تەعدادی یاران

بە سەد هاوین و زستان و بەهاران... حاجی قادری کۆیی

عەونی ئەمەی زۆر بەلاوە جوان بووەو هاتووە پێشەکی و بۆنەیێکی دیکەی لەسەر ئەو بنەمایەی بیری حاجی لەو دێڕەیدا دروست کردووەو درێژتر لەوە، بەڵام لەسەر هەمان نەزم نووسیویەتی:

ـ نەبینن ئێوە قەت مەرگی عەزیزان

نەکەن شیوەن لە داخی کۆچی یاران

کەسێك گەر موبتەلابوو بەم بەڵایە

هەتا دەمرێ مەحاڵە شادی جاران

تیماری ناکرێ زامێکی سەختە

بە سەد هاوین و زستان و بەهاران... عەونی

٦ـ ئیقتیدای بێخود بە حەمدی

ـ مەجنونی زلفی خاوی چ لەیلایەکی لە چۆل؟

بەم لێوی وشکەوە بە هەموو دەم دووانی کێی؟... حەمدی

بێخود ئیقتیدای بەم شیعرەی حەمدی کردووە، گووتوویەتی:

ـ مەجنونی دوو گیسۆیی چ لەیلاییێکە ئاخۆ

یا وامیقی جادوویی چ عەزراییێکە ئاخۆ

دێوانەیی ئاهوویی چ سەحراییێکە ئاخۆ

کان چیهرە پەری دیوە کە ترساوە دڵی من؟ ... بێخود

دەبینین لە رووەکانی شێواز و وشەوە تا رادەییێکی ئاشکرا بێخود بە کارتێکراوی حەمدی ئەو پارچەیەی خۆی نووسیوە.

### ٧ـ ئیقتیدای شێخ نوری شێخ بابا عەلی، بە شیعرێکی حەمدی

ـ بۆچ هەوا ئاڵۆزە بۆچی لێڵ و سوورە ئاسمان

گێژەلۆکەی نەگبەتە، یا فیتنەیی ئاخر زەمان... حەمدی

شێخ نوری شێخ بابا عەلی بەم شیعرەی حەمدی کارتێکراو بووەو ئیقتیدای پێکردووە:

پێم بڵێن بۆ لێڵە ئاسمان تەم بەری واگرتووە

یا هەناسەی دووکەڵینی خێڵە جۆشی سەندووە... شێخ نوری شێخ بابا عەلی

### ٨ـ ئیقتیدای حەمدی بە حاجی قادری کۆیی

ـ هەموو عومرم لە ڕێی هات و نەهاتی

بەسەرچوو ئەی ئەجەل تۆ هەر نەهاتی... حاجی قادری کۆیی

(حەمدی)ش گوتوویەتی:

ـ ڕەقیب بۆ بەزمی خەلوەتمان کە هاتی

وەکو دوومەڵ لە جێی ناسك دەراتی

لە شەوقی ڕوومەتی ئاوابوو ڕووژەرد

قەمەر ئەی شەمس ئیتر تۆ بۆ هەڵاتی... حەمدی

مەست دەکەین حەمدی لەسەر هەمان کێش و سەروای شیعرەکەی حاجی قادری کۆیی و تەنانەت بە وەرگرتنی وشەکانی (هاتی) و دروستکردنی وشەی (هەڵاتی)ش کە وشەیێکی نزیکی (هاتی)یەو هاومۆسیقایەتی، ئیقتیدای بە حاجی قادری کۆیی کردووە.

**تێبینی:**

جۆرێکی دیکەی ئیقتیدا هەیە، بە (ئیقتیدای نادیار) ناوی دەنێین، ئەمە چونکە دیار نییە کێ ئیقتیدای بە کێ کردووە.

مەبەست لە ئیقتیدای نادیار ئەو ئیقتیدایەی شاعیرێکە بە شاعیرێکی تر، کە لەبەر نەبوونی بەڵگەی کۆنتری و لەبەرئەوەی هەردووکیان هاوچەرخی یەك بوونەو هەردووکیان مێژووی شیعرەکانیان دیار نییە، ئیتر ئاسان نییە بزانرێت، کامیان لە کامیان وەرگرتووە، بەڵام بە ئاشکرا دەزانرێ ئەم دوو پارچە شیعرەیە یەکیان ئیقتیدای بە ئەوی تریانەوە کردووە، بۆ نموونە: شێخ رەزای تاڵەبانی گوتوویەتی:

ـ چەرمی ڕووی هێند قایمە شمشێری میسری نایبڕێ

گەر بە کەوشی کەی دەمێنێ، تا قییامەت نادڕێ... شێخ ڕەزانی تالەبانی

حاجی قادری کۆییش گوتوویەتی:

بیکەبەر دیبایی نەزمم تا قیامەت نادڕێ

چونکە ئەبکاڕی مەعانی تار و پۆیی ڕستووە... حاجی قادری کۆیی

تەماشا دەکەین ئەم دوو شیعرە هەردووکیان:

١ـ لەسەر یەك کێشن

٢ـ هەردووکیان بە یەك سیستەمی دەنگی نووسراون

٣ـ نیوەی وشەکانیان لە نیوەدێڕی یەکەمدا وەکو یەکە

بەڵام نازانین شێخ رەزا ئیقتیدای بە حاجی کردووە، یان بە پێچەوانەوە حاجی ئیقتیدای بەو دێڕەی شێخ کردووە، ئەوەی دەیزانین ئەوەیە ئیقتیدایە ئاشکرایەو گەیشتۆتە ئاستی شت لێکوەرگرتنیش، ئەوەش ئەگەر بە کارتێکراوی یەکیان بە ئەوی دیکەیانەوە نەبووایە، قەت وەها دەرنەدەچوو.

## داهێنان:

عەرەب (ابداع)ی پێدەڵێن.. بریتییە لەوەی شیعر، یان ئاخاوتن بە گشتی چەند جۆرێکی جوانکاریی تیا بێت.. دیارە لێرەدا مەبەست لە وشەی جوانکاری واتای زاراوەیی نییە، بەڵکو واتای وشەییتی، بە واتا: ئاخاوتن چەند هونەرێکی جوانی ڕەوانبێژی لەخۆ بگرێت.. ئەوەتا (ابن ابي الأصبع) کاتێك باس لە جوانکارییەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکات: ﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾..(هود : ٤٤).. دێت هونەرەکانی تیا بەرجەستە بووی دەژمێرێت، دەڵێت: ئەم هونەرانە لە خۆ دەگرێت: دژیەك، حسن النسق، جوانی بایس، دابەشکردن، ئاماژە، هێماکەر، ارداف، ایجاز، خوازە، خواستن و... هتد. دیارە هیچ یەکە لە خوازە و خواستن سەر بە زانستی جوانکاری نینە.

بە کورتی: داهێنان ئەو دەربڕینانە دەگرێتەوە، کە دەوڵەمەند و جوانکرابن بە ژمارەیێك هونەری لێکجیای ڕەوانبێژی و بە هەموویان جەمالیاتێکی دڵگیری پێ بدەن.. بۆ نموونە:

ـ گا دەسووتێم، گا دەگرییێم، غەرقی ئاو و ئاورم

ئاخ لە دەست بەختی سیاھ نازانم ئەز بۆ نامرم؟... وەفایی

١ـ (گا) دوو جار لە پاڵ وشەکانی (دەسووتێم) و (دەگرییێم) گێردراوەتەوە، ئەوەش (گێڕانەوە)یە.

٢ـ دەسووتێم و دەگرییێم لە بەشی یەکەمی گوتە پێکەوە پێچراون، لە بەشی دووەمیشدا هەر لە هەمان نیوە دێڕدا، (غەرقی ئاو) و (ئاور) لە بەرامبەر ئەو دوو وشەیەی پێشەوە بۆیان پەخشکراونەتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی نارێك، چونکە وشەی دووەمی بەشی دووەم (ئاوڕ) پەیوەندی هەیە بە وشەی یەکەمی بەشی یەکەم، کە (دەسووتێم)ە، وشەی یەکەمی بەشی دووەمیش (غەرقی ئاو) پەیوەندی هەیە بە وشەی دووەمی بەشی یەکەم، کە (دەگرییێم)ە، بەوەش (پێچەوپەخشی نارێك) بەرهەم هاتووە.

٣ـ لە نیوە دێڕی یەکەمدا موبالەغە هەیە، چونکە حاڵەتی شاعیر بەو شێوەیە، نییە کە پیشانی دەدات.

٤ـ لە نیوە دێڕی دووەم پرسیاری خوازەیی هەیە، چونکە پرسیارەکە وەڵامی ناوێ.

٥ـ لە نێوان وشەکانی (ئاو) و (ئاور) ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد هەیە.

٦ـ لە نێوان وشەکانی (ئاورم) و (نامرم)دا ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی هەیە.

٧ـ غەرقبوون هی ئاوە، ئادەمیزاد لە نێو ئاو غەرق دەبێت، بەڵام ئەمە دراوەتە (ئاور)یش، کە ئەوەش (خواستنی درکاو)ە.

٨ـ (ئاخ لەبەر بەختی سیا) گوتەی ئامادەی سەرزارییە، شاعیر وەریگرتووەو بەبێ ئاماژە بە شیعرەکەی خۆی تێکەڵ کردووە، ئەوەش لێیوەرگرتنە (أقتباس)ە.

٩ـ (نازانم ئەز بۆچ نامرم) گوتەی ئامادەی سەرزارییە، شاعیر وەریگرتووەو بەبێ ئاماژە بە شیعرەکەی خۆی تێکەڵ کردووە، ئەوەش لێیوەرگرتنە (أقتباس)ە.

### چەند نموونەیەکی داهێنان:

ـ من دی سەحەر شاهی مەجەر لبسی دبەر مەخمور بوو

ئەو دیم زەری سوور موشتەری یا ڕەب پەری یا حوور بوو... مەلای جزیری

١ـ لە نێوان وشەکانی (سەحەر) و (مەجەر) ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی هەیە.

٢ـ هۆنراوەکە هەردوو دێڕی زۆر بە جوانی کەرتکراوە، هەر نیوە دیڕەی کراوەتە چوار کەرتی جوان.

٣ـ نیوە دێڕی یەکەم هەواڵێ مەجازییە، بۆ پیشاندانی سەرسامییە.

٤- (یا ڕەب پەری یا حوور بوو) پرسیاری مەجازییە، بە واتای هەواڵ هاتووە، واتە: دەتگوت پەری ، یا حورە، ئەوەندە جوانە.

٥- دیسانەوە لە (پەری و حوور)دا دوو خواستنی ئاشکرا هەیە، چونکە هەردووکیان بۆ کەسە وەسفکراوەکە هاتوون.

٦- دواخستن و پێشخستن هەیە لە هەردوو نیوە دێڕەکان

٧- (شاهی مەجەر) خواستنی ئاشکرایە، واتە ئەو کەسەی لە جوانیدا، لە دڵگیریدا وەکو شاهی مەجەر وەهایە، ئەوم بینی.

٨- لە نێوان وشەکانی (سوور) و (حوور)دا ڕەگەزدۆزی ناتەواوی جودا هەیە.

٩- کورتبڕی زۆر لە هەردوو نیوە دێڕەکان هەیە.

ـ ئەی مەهی دوو هەفتە تا شەمس و قەمەر تۆیان نەدی

دانەگیرسان ئەو میسالی ئاگر ئەمیان گڕ نەبوو... حاجی قادری کۆیی

١ـ بانگکردنی تیایە لە (ئەی مەھ)

٢ـ (مەھ) خواستنە لە باتی کەسێکی وەکو مانگ جوان هێنراوە

٣ـ شەمس و قەمەر (چاولەیەك)یان دروست کردووە، چونکە هەردووك بە واتای دروست هاتوون.

٤ـ (شەمس) و (قەمەر) لەژێر بڕیاری (تۆیان نەدی) کۆکراونەتەوە، ئەوەش (کۆکردنەوە)یە

٥ـ هەموو دێڕەکە (جوانی بایس)ـە

٦ـ لە نیوە دێڕی دووەم (ئەو میسالی ئاگر)، (ئەمیان گڕ) دابەشکردنە.

٧ـ دانەگیرسان (خوازە)یە، بە واتا بەم شێوە تووڕە نەبوون و گەرم دانەهاتن تا وەها بدرەوشێنەوە.

٨و٩ـ دوو (لێکچوواندنی نائاشکرا) هەیە، یەکیان (شەمس) بە (ئاگر) و دووەمیان (قەمەر) بە (گڕ) چووێنراون.

١٠ـ رستەکە خەبەری خوازەییە، مەبەستی ئەوەیە بڵێ: ئەی فلان تۆ زۆر جوانی و مانگ و رۆژ ئیرەییت پێدەبەن.

١١ـ لە نێوان (ئەو) و (ئەم) دژیەك هەیە.

١٢ـ هەواڵی دێڕەکە موبالەغە لە جوانی بانگکراو دەکات.

١٣ـ ئەو میسالی ئاگر (کورتبڕییە بە لادان)، واتە: (ئەو لە گەرمی و تووڕەییدا میسالی ئاگر نەبوو).

١٤ـ ئەمیان گڕ نەبوو، کورتبڕییە بە لادان، دروستەکەی ئەوەیە: (ئەمیان لە گەرمی و تووڕەییدا میسالی گڕ نەبوو).

ـ مەبە غافڵ یەکێ بگرە دوو بەردە
کە دنیا هەر هەوایی حەڕ و بەردە
بچووك و گەورە زانیوتە نەتیجەی
گەزێ ئەرز و دوو گەز جاو و سێ بەردە... حەمدی

لەم چوارینەدا ئەم هونەرانەی رەوانبێژی بەرجەستەنە:

١ـ بەرامبەری دوویی رێك هەیە لە نیوە دێڕی یەکەم، سەرەتا (یەکێ بگرە) هاتووە، لە دوای ئەودا (دوو بەردە) هاتووە، (دوو) لە بەرامبەر (یەك) و (بەردە) لە بەرامبەر (بگرە).

٢ـ دێڕی یەکەم تەصریعکراوە.

٣ـ لە نێوان (حەڕڕ) و (بەڕد)دا دژیەکی فەرهەنگی هەیە.

٤ـ لە نێوان (بچووك) و (گەورە)دا دژیەکی فەرهەنگی هەیە.

٥ـ گێڕانەوە هەیە، ئەوەتا وشەی (گەز) جارێك لە پاڵ ئەرز و جارێك لە پاڵ جاو گەڕێنراوەتەوە.

٦ـ لە نێوان سێ وشەکانی (بەردە)دا ڕەگەزدۆزی تەواو هەیە.. (بەردە)ی یەکەم فرمانی داخوازییە، لە چاوگی (بەردان)ەوە هاتووە.. (بەردە)ی دووەم پێکهاتووە لە (بەرد) کە وشەیێکی عەرەبییەو ناوە بە واتای (سەرما)ی کوردییەوە هاتووە، لەگەڵ (ە)ی فرمانی ناتەواوی دەمی ئێستا.. (بەردە)ی سێیەمیش پێکهاتووە لە وشەی (بەرد)ی کوردی، کە ناوی گشتییە و بەرامبەرە بە (حجر)ی عەرەبی، لەگەڵ (ە)ی فرمانی ناتەواوی دەمی ئێستا.

٧ـ بچووك و گەورە زانیوتە نەتیجەی؟ پرسیاری خوازەییە و بۆ وەرگرتنەوەی وەڵام نەهاتووە، بەڵکو بۆ وشیارکردنەوە هێنراوە.

٨ـ نەتیجەی، گەزێ ئەرز و دوو گەز جاو و سێ بەردە.. کینایەیە لە قەبر و مردن.

٩ـ لە (مەبە غافڵ)دا نەهێشتنی خوازەیی هەیە، کە بۆ مەبەستی تکاو وشیارکردنەوە هاتووە.

١٠ـ لە (یەکێ بگرە)دا فرمانی خوازەیی هەیە، کە بۆ مەبەستی تکاو وشیارکردنەوە هاتووە.

١١ـ لە (دوو بەردە)دا فرمانی خوازەیی هەیە، کە بۆ مەبەستی تکاو وشیارکردنەوە هاتووە.

١٢ـ لە (یەکێ بگرەدا) تێلنیشانی واتایی هەیە، بۆ ئەو گوتەیەی پێشینانی کورد، کە دەپرسێت: ((یەك زۆرترە، یا هەزار)؟ لە وەڵامدا دەگوترێت: (یەك)، چونکە (یەك) خودایە و (هەزار) مەخلوقی خودان، کەواش بێ (یەك) زۆرتر و گەورەتر و بەتواناترە لە (هەزار و لە هەزار هەزاریش).

١٣ـ دنیا هەر هەوایی حەڕ و بەردە.. خەبەری داواکراوە، چونکە جەختێنراوە بە ئاوەڵناوی نادیاری (هەر).

١٤ـ بچووك و گەورە.. کینایەنە لە کەسی گەورە و کەسی بچووك.

١٥ـ گەزێ ئەرز و دوو گەز جاو و سێ بەردە.. لە (سێ بەردەدا) موشاکەلە هەیە، لەگەڵ سێ بەردەی تەلاق. ئەگەرچی پەیوەندییان پێکەوە نییە.

١٦ـ لە (مەبە غافل)دا بانگکردن هەیە.

ـ تەماعم بوو دونیا و عوقبا بخۆم
ئەمم چوو لە دەست و ئەوم بۆ نەهات... حاجی قادری کۆیی

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانەی ڕەوانبێژی هەیە:

١- دژیەك.. لە (دونیا و عوقبا)دا دژیەکی فەرهەنگی هەیە، چونکە دوو وشەی دژو پێچەوانەی یەکن و هەریەکە و لە فەرهەنگدا ڕەگێکی سەربەخۆیان هەیە.

٢- کۆکردنەوە.. لە نیوە دێڕی دووەمدا (دونیا و عوقبا) لە ژێر فرمانی (بخۆم)دا کۆکراونەتەوە.

٣- دابەشکردن.. لە نیوە دێڕی دووەمدا، لە دەستچوون بە هۆی ڕاناوی ئەم بۆ دونیا و بۆ نەهاتن بە هۆی ڕاناوی ئەو بۆ عوقبا دابەشکراون.

٤- بەرامبەری.. لە نیوە دێڕی دووەمدا بەرامبەری سێیی هەیە، سەرەتا (ئەمم چوو لە دەست) هاتووە، دواتر (ئەوم بۆ نەهات) هاتووە، (ئەو) لە بەرامبەر (ئەم)، (بۆ) لە بەرامبەر (لە)، (نەهات) لە بەرامبەر (چوو).

٥- کینایە.. دونیا و عوقبا بخۆم.. کینایەیە لە هیوای درێژ و حەزی زۆرکردن لە ژیان.

٦- خوازە.. لە وشەی (بخۆم)دا خوازە هەیە، چونکە بۆ مەبەستی درووستی خۆی نەهاتووەو بە مانای دەستخستن هاتووە.

ـ تا بڵێی فەرقی هەیە میهری من و ماهی فەلەك
لە (ثـهرا) تا بە (ثـورةیيا) لە (سەما) تا بە (سەمەك)... حاجی قادری کۆیی

لەم دێڕەدا ئەو هونەرانەی ڕەوانبێژی بەرجەستە دەبن:

١- خوازە لە میهری من، کە مەبەست لێی یاری منە.

٢- لێکدردنەوە هەیە لە نیوە دێڕی یەکەمدا، میهری من و ماهی فەلەك.

٣- جێگۆڕینی واتایی هەیە، لە نیوە دێڕی دووەمدا واتا لە (عەرزەوە تا کۆمەڵە ئەستێرەی پیرۆ لە ئاسمان) و (لە ئاسمانەوە تا ئەو ماسیەی لە ئەفسانەدا لە بنی دەریا و گای لەسەر وەستاوەو دونیا لەسەر پشتی گاکەیە و بەم شێوەیە...).

٤- دژیەکی درکاو لە (میهری من) مەبەست لێی نزمییەو، (ماهی فەلەك) مەبەست لێی ئاسمانە.

٥- لە پەڕا و پورەیا، کە یەکەمیان لە زەوییە و دووەمیان لە ئاسمانە دژیەکی دوور هەیە.

٦- سەمەك تێلنیشانە بۆ ئەفسانەی دونیا لەسەر پشتی گاو گا لەسەر پشتی ماسی و ماسی لە بنی دەریا و... بەم شێوەیە.

٧- سەما و سەمەك دژیەکی وێنەییە، چونکە سەمەك نزمترینە بە پێی ئەفسانە کە گایەکەی لەسەر پشتیەتی، سەماش بەرزە.

٨- دێڕەکە تەصریعکراوە.

ـ ئافتابی حوسنی تۆ ڕۆژە کە دێ و ئاوا دەبێ
قامەتیشت وەك هیلالی یەك شەوە ئاوا دەبێ... حاجی قادری کۆیی

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانە هەیە:

١ـ ڕەگەزدۆزی تەواوی بلاّو هەیە لە (ئاوا دەبێ)، لە نیوەی یەکەم بە واتای (ئاوابوون و بزربوون) دێ و لە دووەمیش بە وەتای (وەها دەبێ) هاتووە.

٢ـ دێڕەکە تەرسیعکراوە.

٣ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد هەیە، لە (دێ) و (دەبێ)دا.

٤ـ دژیەکی هەیە لە (دێ) و (ئاوادەبێ)دا.

٥ـ خواستنی درکاو هەیە لە ئافتابی حوسنی تۆدا.

٦ـ لێکچوواندنی درێژە (التشبیة المفصل) هەیە، لە (ئافتابی حوسنی تۆ رۆژە، کە دێ و ئاوا دەبێ)دا، ئەمە ئەو لێکچوواندنەیە، کە رووی لێکچوواندنی تێدایە، بەلاّم ئەوزاری تێدا نییە).

٧ـ لێکچوواندنی ئاسایی (التشبیة ال) هەیە لە نیوە دێڕی دووەمدا، چونکە هەر چوار بنەڕەتەکانی لێکچوواندنی تیا هاتووە.

٨ـ لە نیوە دێڕی یەکەمدا کینایە هەیە بۆ کورتی ماوەی دەرکەوتن و ونبووندا.

٩ـ لە نیوە دێڕی دووەمدا

١٠ـ لە هیلالی یەك شەوەدا تایبەتی هەیە (القصر).

ـ سەما هەر بۆ سەما ئەسبابی تاقەی شینی پۆشیوە

کەواکیب بۆ نیسارە هەڵدەڕێژن شوعلە وەك گەوهەر... حەمدی

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانە هەیە:

١ـ ڕەگەزدۆزی تەواو لە نێوان دوو وشەی (سەما)دا.. کە:

(سەما)ی یەکەم واتە: ئاسمان

(سەما)ی دووەم واتە: هەڵپەڕین و سەماکردن

٢ـ لێکچوواندنی پوختە (التشبیه المجمل) لە (شوعلە وەك گەوهەر)دا هەیە، ئەو لێکچوواندنەیە، کە ئەوزاری تێدایە، بەڵام ڕووی لێکچوونی تێدا نییە. شوعلە: لێیچووە.. گەوهەر: لەوچووە.. وەك: ئەوزارە.

٣ـ ڕەگەزدۆزی ناتەواوی زیاد لە نێوان (گەوهەر) و (هەر)دا هەیە.

٤ـ ئەسبابی تاقەی شین: کینایەیە لە جل و بەرگ.

٥ و ٦ـ دوو جوانی بایس:

أ ـ لە نیوە دێڕی یەکەمدا شاعیر دەڵێت: ئاسمان بۆ سەماکردن بەرگی شینی پۆشیوە! ئەمە لێکدانەوەی شاعیرە بۆ ئەو شینیەی لە ئاسمان دەیبینێ، کە ئەمەش هۆی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو لێکدانەوەی شاعیرانەیە، هۆی ڕاستەقینە ئەوەیە: کوتلەی هەواو غاز لە نێوان زەوی و ئەستێرەکانی دوور لە زەویدا هەیە، ئەو ئەستێرانەی لە دوورڕا وەکو ئاسمانی دونیا دەکەونە بەرچاو، ئەم گاز و هەوایەش کە بە چڕییەکی زۆر لەسەر یەکن ئەوە بۆ دوور وەکو شین خۆ دەنوێنن، دەنا ئاسمان نە سەما دەکات و نە بۆ ئەوەش خۆ دەڕازێنێتەوەو جلی شینی جوان لەبەر دەکات، جل ئادەمیزاد لەبەری دەکات و سەماش هەر تایبەتە بە ئادەمیزاد و کەسانێك لە باری ئاهەنگ و دڵخۆشیدا ئەنجامی دەدەن، بۆیە ئەمە لێکدانەوەییێکی جوان و دڵگیرە بۆ بابەتەکەو بە (جوانی بایس) دادەنرێت.

ب ـ لە نیوە دێڕی دووەمیشدا شاعیر دەڵێت: کەواکیب بۆ نیسار شوعلەی وەکو گەوهەر هەڵدەڕێژن، ئەمەش دیسانەوە هەڵڕێژتنی فرمێسك تایبەتە بە ئادەمیزاد و ئەو بۆ خۆشی و ناخۆشییەکان دەشێ فرمێسکی وەکو گەوهەر ببارێنێ، بەڵام شاعیر بە لێکدانەوەییێکی

شاعیریانە ئەو خەیاڵەی کردووەو ئەوەی گوتووە، ئەمەش لێکدانەوەییێکی جوان و دڵگیرە بۆ بابەتەکەو بە (جوانی بایس) دادەنرێت.

ـ جیهان بوویتە جەزیرەی بەحری گریەم
بەبێ بوختان ئەتۆ زین و ئەمن مەم... حاجی قادری کۆیی
لەم دێڕەدا ئەو هونەرانەی ڕەوانبێژی بەرچاو دەکەون:
١ــ لە (جیهان بوویتە جەزیرەی بەحری گریەم) دا لێکچوواندنی پوختە (التشبیة المجمل)هەیە، ئەو لێکچوواندنەیە، کە ئەوزاری تێدایە، بەڵام ڕووی لێکچوونی تێدا نییە.
٢ـ هەر لە نیوە دێڕی یەکەمدا (جیهان بوویتە جەزیرەی بەحری گریەم)، موبالەغە هەیە، چونکە ئەوەی گوتراوە ئەقڵ پەسندی ناکات.
٣ـ لە (بەحری گریەم)دا خواستنی درکاو هەیە.
٤ـ لە نیوە دێڕی دووەمدا لە (ئەتۆ زین) و (ئەمن مەم)دا، لێککردنەوە هەیە.
٥ـ لە (ئەتۆ) و (ئەمن)دا دژیەکی فەرهەنگی هەیە، لە ڕاناوی سەربەخۆ.
٦ـ لە نێوان (زین) و (مەم)یشدا دژیەك هەیە، کە یەکیان مێ و ئەویتریان نێرە.
٧ـ لە بەدوای یەکدا هاتنی (ئەتۆ زین) و (ئەمن مەم)دا بەرامبەری هەیە.
٨ـ لە (ئەتۆ زین)دا بەهێزترین لێکچوواندن هەیە.
٩ـ لە (ئەمن مەم)دا بەهێزترین لێکچوواندن هەیە.
١٠ـ زین و مەم تێلنیشانن بۆ دوو پاڵەوانەکانی داستانی مەم و زینی ئەحمەدی خانی.

ـ وەك گەوهەرە بەردو گلەکەت عەینی جەواهیر
بێمیسلە موحەققەق چ لە باتین چ لە زاهیر... حەمدی

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانەی ڕەوانبێژی بەدی دەکرێن:
١ــ لە (وەك گەوهەرە بەرد)تدا لێکچوواندنی پوختە (التشبیة المجمل)هەیە، ئەو لێکچوواندنەیە، کە ئەوزاری تێدایە، بەڵام ڕووی لێکچوونی تێدا نییە.
٢ـ لە (گلەکەت عەینی جەواهیر)دا لێکچوواندنی پوختە (التشبیة المجمل)هەیە، ئەو لێکچوواندنەیە، کە ئەوزاری تێدایە، بەڵام ڕووی لێکچوونی تێدا نییە.

٣ـ لە نێوان (باتین) و (زاهیر)دا دژیەکی فەرهەنگی هەیە.

٤ـ گێڕانەوە هەیە، بە پیتی (چ)، کە دوو جار لە پاڵ (لە باتین) و (لە زاهیر)دا گێڕدراوەتەوە.

٥ـ گێڕانەوە هەیە، بە ئامرازی پەیوەندی (لە)، کە دوو جار لە پاڵ (باتین) و (زاهیر)دا گێڕدراوەتەوە.

٦ـ بەیتەکە تەسریعکراوە.

٧ـ لە نێوان (جەواهیر) و (لە زاهیر)دا رەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی هەیە.

ـ تۆ بڵێ بەو تاقمەی ساڵێ کە نێرن ساڵێ مێ
بۆچی کولارەن دەبن گاهێ بە خاڵەو گەهـ بە پور... حەمدی

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانەی رەوانبێژی هەنە:

١ـ (ساڵێ) گێڕانەوەی دروست کردووە، کە جارێك لە پاڵ (نێر) و جارێك لە پاڵ (مێ) گێڕدراوەتەوە.

٢ـ (گاهێ) گێڕانەوەی دروست کردووە، کە جارێ لە پاڵ (بە خاڵە) و جارێك لە پاڵ (بە پور)دا گێڕدراوەتەوە.

٣ـ (بە) گێڕانەوەی دروست کردووە، کە جارێ لە پاڵ (خاڵە) و جارێك لە پاڵ (پور)دا گێڕدراوەتەوە.

٤ـ لە نێوان (نێر) و (مێ)دا دژیەکی فەرهەنگی هەیە.

٥ـ لە نێوان (ساڵێ کە نێرن ساڵێ مێ) و (گاهێ بە خاڵەو گەهـ بە پور)دا پێچەوپەخشی رێك هەیە.

٦ـ لە نیوە دێری دووەمدا (بۆچی کولارەن)، پرسیاری خوازەیی هەیە، مەبەستی نەفیکردنە، واتە (کولارە نینە).

٧ـ لە نێوان (ساڵێ) و (گاهێ)دا موازەنە هەیە، چونکە هاوکێشن، بەڵام هاوسەروا نینە.

ـ وەك گەوهەرە بەردو گڵەکەت عەینی جەواهیر
بێمیسلە موحەققەق چ لە باتین چ لە زاهیر... حەمدی

لەم دێڕەدا ئەم هونەرانەی رەوانبێژی بەدی دەکرێن:

١ــ لــه (وەك گەوهــەرە بەرد)تــدا لێکچــوواندنی پوختــە (التشــبیە المجمــل)هەیــە، ئــەو لێکچوواندنەیە، کە ئەوزاری تێدایە، بەڵام ڕووی لێکچوونی تێدا نییە.

٢ـ لە (گلەکەت عەینی جەواهیر)دا لێکچــوواندنی پوختــە (التشــبیە المجمــل)هەیــە، ئــەو لێکچوواندنەیە، کە ئەوزاری تێدایە، بەڵام ڕووی لێکچوونی تێدا نییە.

٣ـ لە نێوان (باتین) و (زاهیر)دا دژیەکی فەرهەنگی هەیە.

٤ـ گێڕانەوە هەیە، بــە پیتــی (چ)، کــە دوو جــار لــە پــاڵ (لــە بــاتین) و (لــە زاهــیر)دا گێڕدراوەتەوە.

٥ـ گێڕانەوە هەیە، بە ئامرازی پەیوەندی (لە)، کە دوو جار لە پــاڵ (بــاتین) و (زاهــیر)دا گێڕدراوەتەوە.

٦ـ بەیتەکە تەسریعکراوە.

٧ـ لە نێوان (جەواهیر) و (لە زاهیر)دا ڕەگەزدۆزی ناتەواوی هاوکێشی هەیە.

**جوانی داهێنان (ابداع):**

١ـ جوانی داهێنان لەوە دایە، کە دێڕەکە لە ڕووی واتاوە زۆر فراوانتر دەبێت، بە هۆی ئەو هەموو هونەرەی لە خۆی دەگرێت.

٢ـ بە هۆی هەموو ئەو هونەرانەی لــەو دێــڕو چــوارین و پارچــە کورتانــەی شــیعر، یــان پەخشاندا بەرجەستە دەبن، چێژی ئەدەبی خۆشیان لێ بەرجەستە دەبێت و جوانییەکی دڵگیریان بۆ دروست دەبێ.

# سەرچاوەکان

**یەکەم:** بە زمانی عەرەبی:

ـ صەحیحی موسلیم.

ـ مەسنەدی ئیمام ئەحمەد.

ـ سونەنی ئەلدارمی.

ـ ابن منظور، لسان العرب، بەرگی هەشتەم، بەیروت ١٩٦٨.

ـ ابو بكر بن علي بن عبدالله المعروف: بابن حجة الحموي، خزانة الأدب وغاية الأرب، دراسة: د. كوكب دياب، الطبعة الثانية، دار صادر، بيروت ـ لبنان، ١٤٢٥هـ، ٢٠٠٥م.

ـ د. احمد مطلوب، فنون بلاغية، (ط:١)، كويت ١٩٧٥.

ـ د. انعام فوال عكاوي، المعجم المفصل لعلوم البلاغة العربية، مراجعة: أحمد شمس الدين، الطبعة الثانية (طبعة جديدة منقحة)، دار الكتب العلمية، بيروت ـ لبنان، ١٤١٧هـ، ١٩٩٦م.

ـ خطيب القزويني، الايضاح في علوم البلاغة طبعة ايران.

ـ سعدالدين تفتازاني، شرح المختصر، ج:٢، طبعة ايران.

ـ د. شوقي ضيف، البلاغة تطور وتاريخ (ط:٣)، مصر ١٩٧٦.

ـ د. عبدالقادر عبدالجليل، الأسلوبية وثلاثية الدوائر البلاغية، الطبعة الأولى، عمان ـ اردن، دار صفاء للنشر والتوزيع، ١٤٢٢هـ، ٢٠٠٢م.

ـ علي الجارم ومصطفي امين، البلاغة الواضحة، طبعة مصر ١٩٦٩.

ـ محمود البستاني، القواعد البلاغية، (ط:١)، مشهد ١٤١٤هجريية.

**دووەم:** بەزمانی کوردی:

ـ ئازاد عەبدولواحید، دیوانی شێخ نووری شێخ سالح، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم (چ:١)، بەغداد، ١٩٨٦.

ـ ئەحمەد رەشوانی، فەرهەنگی هەڵبەست، (چ:٢)، بەغداد، ١٩٨٣.

ـ ئەحمەدی کۆر، دیوان و شەرحی حاڵی شێخ ئەحمەدی کۆر.

ـ ئەحمەدی موفتی زادە، مەولودنامە، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٥.

ـ ئەحمەد موختار جاف، دیوانی ئەحمەد موختار جاف، ئا: د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ (چ:١) بەغداد، ١٩٨٦.

- ئەحمەد هەردی، رازی تەنیایی، (چ:٢)، هەولێر، ١٩٨٤.
- د. ئەمین موتابچی، دیوانی مەلا وەسمان، ١٣٩٣هیجری ـ ١٩٧٣ز، چاپخانەی ئاداب، نەجەف.
- ئەمین فەیزی، ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد.
- ئومێد ئاشناو عەبدولکەریم موفتی، دیوانی موفتی پێنجوێنی، (چ:١) بەغداد ١٩٩٠.
- ئەحمەد دەروێش عەبدوڵڵا (ئەخۆڵ)، دیوانی ئەخۆڵ، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئەدیبی بەغدادی، بەغدا، ساڵی ١٩٨٤.
- ئەحمەدی خانی، مەم و زین، و: هەژار، چاپی پاریس، ١٩٨٩.
- سەید ئەحمەدی نەقیب، دیوانی سەید ئەحمەدی نەقیب، ئا: مەحمود ئەحمەد محەمەد، چاپخانەی (أرشاد)، بەغدا، ١٩٨٥.
- ئومێد کاکەڕەش، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، چاپی سلێمانی، ١٩٩٩.
- ئومێد کاکەڕەش، دیوانی حیلمی، (چ:١) سلێمانی، ١٩٨٥.
- ئیبراهیمی ئەفخەمی، دیاری نوێ، بەبێ ناوی چاپخانە و ساڵ.
- ئیدریس عەبدوڵڵا، جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، چاپخانەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣ز.
- سەید برایمی حاجی سەید سەعیدی بەرزنجی (برژاو)، چوارینەکانی برژاو، چاپی یەکەم، بەرلین، ١٩٩٦.
- بورهان قانیع، دیوانی قانیع، (چ:١) بەغداد، ١٩٨٤.
- بێبەش، هەندێ لە پێنج خشتەکییەکانی بێبەش، (چ:١) هەولێر، ١٩٨٤.
- دڵزار، دیوانی دڵزار، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر.
- مەلا تاهیر مەلا مەعروف قورشاغلویی رەباتی، دیوانی پاکی، ئا: د. ئیبراهیم تاهیر، بڵاوکراوەی تەفسیر، هەولێر، ١٤٢٨هیجری، ٢٠٠٧ز.
- جگەرخوێن، گۆڤاری (بیری نوێ)، ژ- ٢٣.
- حەسەنی دانیشفەر، شنەی لاجانێ، (چ:١) هەولێر، ١٩٩٩.
- مەولانا خالیدی نەقشبەندی، دیوانی شیعری رۆحی مەولانا خالید، وەرگێڕانی: پیرەمێرد، ئا: مەحمود ئەحمەد محەمەد، چاپخانەی زەمان، بەغداد، ١٩٨٧.
- (ڕازی)، چوارینەکانی بابا تاهیری عوریان، (چ:١) بەغداد، ١٩٧٩.ـ
شێخ رەزای تاڵەبانی، دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٣.

ـ زیوەر، دیوانی زیوەر، بەشی یەکەم، (چ:١)، بەغداد، ١٩٥٨.
ـ سامی عەودال، دیوانی سامی عەودال، کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی: د. کەمال مەعروف، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠١٠.
ـ سەردار میران و کەریم شارەزا، دیوانی حاجی قادری کۆیی، (چ:١)، هەولێر، ١٩٨٦.
ـ سەردار میران، دیوانی نووری، (چ:١)، بەغداد، ١٩٨٣.
ـ صادق بەهائەدین، ئامێدی، هۆزانڤانێت کورد (چ:١) بەغداد، ١٩٨٠.
ـ صافی هیرانی، دیوانی صافی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، چاپی سێهەمین ١٩٧٣ز.
ـ عاصی، دیوانی عاصی، ئا: عەزیز گەردی، بڵاوکراوەی تەفسیر، هەولێر، ٢٠٠٨.
ـ عەبدولڕەحمان و سالح عەبدوڵڵا چروستانی، دیوانی چروستانی، (چ:١) سلێمانی ١٩٨٥.
ـ میرزا عەبدولرەحیمی سابڵاخی، دیوانی وەفایی، ئا: محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی ئێران.
ـ عەبدولخالیق عەلائەدین، دڵدار، شاعیری شۆڕشگێڕی کورد (چ:١)، بەغداد، ١٩٨٥.
ـ عەبد ولکەریمی مودەڕیس، بەدیع و عەروزی نامی، (چ:١) بەغداد، ١٩٩١.
ـ عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتح عەبدولکەریم، دیوانی نالی، (چ:١) بەغداد، ١٩٨٠.
ـ عەبدلکەریمی مودەڕیس، دیوانی مەحوی، (چ:١) بەغداد، ١٩٧٧.
ـ عەبدوڵڵا عەزیز خالید، دیوانی کامەران موکری (چ:١) هەولێر، ١٩٨٨.
ـ عەبدوڵڵا عەزیز خالید، دیوانی شیعری (دیلان)، (چ:١) بەغداد، ١٩٨٧.
ـ عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی دووەم: جوانکاری (چ:١) هەولێر ١٩٧٦.
ـ عەزیز گەردی، دیوانی میهری، (چ:١) سلێمانی ١٩٧٧.
ـ عەزیز، دیوانی عەزیز، ئامادەکردنی: محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
ـ عەلائەدین سەجادی، خۆشخوانی، (چ:١) هەولێر، ١٩٨٦.
ـ عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، (چ:٢) بەغداد، ١٩٧٣.
ـ عەلی کەمال باپیر ئاغا، دیوانی کەمالی، (چ:١) بەغداد، ١٩٨٦.
ـ د. عەلی شەریعەتی، یەك لەپەنای خاڵ و سیفری بێ بڕانەوە و: هەژار، (چ:١) ئێران.
ـ عەونی، دیوانی عەونی، (چ:١) هەولێر، ١٩٩٧.
ـ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی، دیوانی لوتفی، (چ:١) بەغداد، ١٩٨٤.
- فانی، دیوانی فانی، (چ:١) سلێمانی ١٩٧٦.
ـ گۆران، سەرجەمی بەرهەمی گۆران، بەرگی یەکەم، بەغداد، ١٩٨٠.

ـ مەجزوب، دیوانی مەجزوب، كۆكردنەوەی: حەكیمی مەلا صالح، ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١.
ـ مەلا مەعروفی كوكایی، چاپی مهاباد، ئێران، بێ ناوی چاپخانە و ساڵی چاپ.
محەمەد رەسول هاوار، دیوانی پیرەمێرد، (چ:١) بەغداد، ١٩٦٨.
ـ د. محەمەد نووری عارف، تێكستی ئەدەبی كوردی، هۆنراوە بەشی دووەم بۆ ساڵی یەكەم، (چ:١) سلێمانی، ١٩٨١.
ـ محەمەدی مەلاكەریم، دیوانی بێخود، چاپی ئێران.
ـ محەمەدی مەلاكەریم، دیوانی بێكەس، (چ:٣) بەغداد، ١٩٨٦.
ـ میرزا غەفور، دیوانی میرزا غەفور، ئا: د. عەبدوڵڵا ئاگرین، بێ ناوی شوێن و چاپخانە و ساڵی چاپ.
ـ مینە جاف، دیوانی مینە جاف، كۆكردنەوەی: مستەفا نەریمان، چاپخانەی جاحز، بەغدا، ١٩٩٠.
ـ ناصیح حەیدەری، دیوانی حەیدەری، ئا: شێروان حەیدەری، چاپخانەی زانكۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٤٢٠هیجری، ٢٠٠٠ز.
ـ هێدی (خالیدی حیسامی)، كاروانی خەیاڵ، (چ:١).
ـ هێمنی موكریانی، تاریك و روون، (چ:١).
ـ هێمنی موكریانی، ناڵەی جودایی، بەغداد، ١٩٧٩.
ـ هەژاری موكریانی، هەمبانە بۆرینە، بەرگی یەكەم (چ:١) ١٣٦٨ هەتاوی.
ـ لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە زمان و ئەدەبی كوردی پۆلی سێیەمی ناوەندی هەولێر، ١٩٩٩.
ـ لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە زمان و ئەدەبی كوردی پۆلی پێنجی ئامادەیی (چ:١١) بەغداد، ١٩٩٢.


**سێیەم: هەندێ رۆژنامە و گۆڤار**


ـ قەرەداغی، رۆژنامەی (رێگای یەكبوون) ژ: ٥٤ سلێمانی ٢٠٠٠.
ـ گۆڤاری سیخورمە، ژ: ٥٨، سلێمانی ١٩٩٩.


**چوارەم:** هەندێ لەپەندی پێشینان و قسە نەستەقەكانی سەرزاری خەڵك لە هەولێر.